# دیوانی بێخود

هۆنراوەی:

مامۆستا مەلا مەحموودی موفتی (بێخود)

کۆکردنەوە و ڕێکخستن و لەسەرنووسینی:
موحەممەدی مەلا عەبدولکەریم



# دیوانی بێخود

(بەشی کوردی)

هۆنراوەی:

مەلا مەحموودی موفتی

کۆکردنەوەو ڕێکخستن و لە سەر نووسینی:

محمدی مەلا کریم

**بڵاوکردنەوەی کوردستان**

**سنە - ۱۳۸۶**




سنه - پاسازی عیززەتی - تەلەفوون - ۲۲۶۵۳۸۲

# دیوانی بێخود

| | |
|---|---|
| ✔ ناوی کتێب (نام کتاب): | دیوانی بێخود |
| ✔ هۆنراوەی (سرودەی): | مەلا مەحموودی موفتی |
| ✔ کۆکردنەوە و رێکخستن و لەسەر نووسینی: | محمدی مەلا کەریم |
| ✔ کەرەتی چاپ (نوبت چاپ): | دووهەم (دوم): ۱۳۹۱ |
| ✔ ژمارەی چاپکراو (تیراژ): | ۳۰۰۰ (بەرگ) جلد |
| ✔ ژمارەی لاپەرەو قەوارە (تعداد صفحه و قطع): | ۱۶۸ صفحەی رقعی |
| ✔ بڵاوکەرەوە (ناشر): | بڵاوکردنەوەی کوردستان (انتشارات کردستان) |

نرخی:
۵۰۰۰ تمەنە

شابک: ۰-۹۲-۷۶۳۸-۹۶۴-۹۷۸
ISBN: 978 - 964 - 7638 - 92 - 0



(بێخود) له رووی نیازەوە، ئەی نازەنین، ئەڵێ:

جارجار بە چاوی لوتف بڕوانە سوورەتم

من بۆیە سەیری تۆ ئەکەم و رووم لە کەس نیە

تا تێ بگەی کە تۆی هەدەفی تیری حیرەتم

بەناوی خودای دەهەندەو دلۆڤان

ئەم دیوانە

هەندێکە لە بەرهەمی هونەری شاعیرێکی پاراو و تەڕ زمانی کورد، چۆرِێك لە دوا چۆڕەکانی شیعری کلاسیکی کوردی، خوا لێ خۆش بوو مامۆستا مەلا «مەحموود»ی موفتی، «بێخود».

هەروەها بەرهەمی رەنجو تەقەلایەکی زۆری منو کاك «عبد الرّحمان» موفتیو چەند کەسێکی تر لە کەسو کارو پاشماوەکانی ئەو شاعیرە بەرزە، وە ئەنجامی دەسو بردی کۆمەڵێکە لەو ئەدەب دۆستانەی کە شیعری بێخودیان لا بوو وە بۆیان ناردین.

کەسو کارو پاشماوەکانی شاعیر، هەرچییان لابووبێ یا بەردەسیان کەوتبێ لە دەفتەرو پاکنووس کراو و روونووسی شیعری کۆکراوەو پەراکەندەی شاعیر، دایانە دەستم. منیش خۆم ماندوو کرد بە خوێندنەوەو بەراورد کردنیانو دیاری کردنی ئەوەیانەوە کە رای «بێخود»ی لەسەر جێگیر بووە لەناو چەند روونووسو پاکنووس کراوێکا، وە بە ساغ کردنەوەی شیعری «ئەبجەد»یەکانیەوە، بەتایبەتی ئەوانەیان کە لەسەر شێوەی ئیملای کۆنی کوردی نووسیونی.

دۆستانی ئەدەبیش گەلێکیان هاتن بەدەم بـانگەوازەکـەمانەوە کـە لە ڕۆژنامەی «برایی»دا بڵاومان کردەوە.

وتم: ئەم دیوانە هەندێکە لە بەرهەمی شیعر وتنی «بێخود»؛ چونکە ئەو شاعیرە کە تەمەنێکی زۆری بە ڕەبەنی بردە سەر، وە لە بەشی هەرە زۆری ژیانیا هیچ جـۆرە ئـەرکێکی دنـیایی بـەسەر شـانەوە نـەبوو، زۆربەی وەختی لە کـۆڕی ئـەدەب و ئـەدەب پـەروەریدا ڕائـەبوارد. ئاشکرایە ئەم دیوانە بچکۆلە بۆ ئەوە ناشێ بەرهەمی "چل"، "پەنجا" ساڵی شاعیرێکی وا بێ.

سەرەڕای ئەوەش «بێخود» لە ژیانیا پەیوەندی ڕۆحی و دۆستایەتی لەگەڵ گەلێ کەسی وادا بووە کە پێش ئەو کۆچی دوایی یان کردووە، وە بە هیچ جۆرێ ناگونجێ، هیچ نەبێ پاش مردنیان نەی لاوانـدبنەوە، وەك گەلێ کەسی لاواندووەتەوە...؛ کەچی ئەم دیوانە شیعرێکی تیا نیە بۆ ئەوانەی وتبێ. ئەمەش بەڵگەیەکی تری ناتەواوی ئەم دیوانەیە.

هەروەها لە ناو ڕوونووسەکانی «بێخود»دا گەلێ نیشانەی ئەوەمان دی کە بۆ هەندێ بابەت شیعری وتووە، کەچی شیعرەکانیش دیار نین. بۆ نموونە "یـەك" "دوو" شیعری پـاکـنووس نـەکـراومـان دی لە لاواندنەوەی خوالێ خۆش بوو سەیید «ئەحمەد»ی خانەقادا لەگەڵ گەلاڵەی مێژووی وەفاتی بە حیسابی ئەبجەد. ئەمەش بەڵگەیەکی تر کەوا «بێخود» گەلێ شیعری تری هەیەو نەکەوتووەتە دەسمان.

هەرچۆن بێ ئێمە چیمان دەس کەوت نووسیمانەوە... تکـاش لە دۆسـتانی «بـێخود»و تـێکڕای خـوێندەوارانـی کـورد ئـەوەیە: کـێ

شیعری‌تری بێخودی لابێ بۆمان بنێرێ، بەڵکوو یا لە هەلێکی‌ترا بڵاوی بکەینەوە، یا ئەگەر خوا یارمەتی داین بیخەینە سەر چاپی دووهەمی ئەم دیوانە.

ئەمە لەباری کۆکردنەوەی ئەم دیوانە، لەبارەی لەچاپدانیشیەوە بە پێویستی سەرشانی خۆمی ئەزانم کە بڵێم: ئەگەر کاك «عبدالرّحمان موفتی» نەبوایە کە ئەرکی لە چاپدانی تێکڕای بەشی «فارسی»و ناتەواوی ئەرکی بەشی «کوردی»یەکەی گرتە ئەستۆ کە وەزارەتی کاروباری شیمال پارەی دا بۆ چاپدانی، بەم زووانە چاوی خوێندەوارانی کورد بە «کلە»ی ئەم شیعرانەی بێخود نەئەڕێژرا. لەبەر ئەوە شایانی سوپاس‌و قەدر زانینە، هەرچەند لە ئەستۆ گرتنی بڵاو کردنەوەی شیعری «بێخود» مایەی شانازییە، نەك تەنها بۆ هەرکام لە بنەماڵەی «موفتی»، بەڵکو بۆ هەر ئەدەب پەروەرێکی کورد...

***

محەممەدی مەلا کەریم

## بەکورتی مێژووی ژیانی «بێخود»
## و بنەماڵەی «موفتی»

«بێخود» ناوی «مەحموود»و کوڕی موفتی حاجی «مەلا ئەمین»ی کوڕی موفتی گەورە، حاجی مەلا «ئەحمەد»ی «چاومارە»، کە ناوبانگی بە «پیر حەسەنی» دەرکردووە. ئەمیش کوڕی مەلا «مەحموود»ی «دێلیژە»یی، پیر حەسەن کوڕی مەلا «ئەحمەد»ی دێلیژەییە کە لە ساڵی "١٢٠٦"ی هێجریدا کۆچی دوایی کردووە. ئەمیش کوڕی مەلا «محەممەد»ی دێلیژەییە کە مەشهوور بووە بە «مەلای گەورە»و لە ساڵی "١١٧٣"دا لە دێلیژە وەفاتی کردووە ئەم زاتە خوێندنگایەکی گەورەی بووە لە دێلیژە، وە هاوچەرخی «شێخ رەزا»ی دێلیژە بووە.

مەلا مەحموودی پیر حەسەنی کوڕەزای مەلا محەممەدی گەورە لای زانای بەناوبانگ «ابن الحاج»ی جێشانەیی خوێندوویەتی و لە پاش ئیجازە وەرگرتنی، خوێندنگایەکی گەورەی کردووەتەوە لە دێلیژەو پاش دروست کردنی شاری «سلێمانی» لە "١١٩٩"دا

چووەتە ئەوێ؛ وە لەگەڵ «شێخ مەعرووفی نۆدێ»یدا پێکەوە لە «مزگەوتی گەورە» دەرسیان وتووەتەوە. وادیارە پێکەوەش فەقێی لای «ابن‌الحاج» بوون. ئەم زاتە "سێ" کوڕی زانای پایە بوڵەندی بووە: (١ـمەلا حەسەن، (٢ـمەلا حسین، (٣ـمەلا ئەحمەد. مەلا حەسەنی ناردووەتە «مەرگە»ی «پژدەر»، وە مەلا حسەینی لە دێلێژە بەجێ هێشتووە[1]؛ مەلا ئەحمەدیشی لەگەڵ خۆی بردووەتە «سلێمانی»و بەم جۆرە باڵی زانستی بەسەر ئەو ناوچانەی کوردستاندا کێشاوە، ئەم زاتە لە "١٢٣٩"دا کۆچی دوایی کردووە.

مەلا ئەحمەدی کوڕی مەلا مەحموودی پیر حەسەنی کە مەشهوور بووە بە «چاومار» لای باوکیو لای شێخ مەعرووفی نۆدێو مەلا «عبدالله»ی رەش خوێندوویەتی کە مەشهوور بووە بە «مەلای رەش»، وە «شێخ الإسلام»ی بابانەکان بووە. ئیجازەشی لای شێخ «مەعروف» وەرگرتووە، ئەم زاتە لە مزگەوتی موفتیدا دەرسی وتووەتەوە کە خۆی دروستی کردووەو ئەکەوێتە نزیکی بەردەرکی سەرای ئێستای سلێمانییەوە، وە خوێندنگایەکی گەورەشی بووە. ئێستا جێگای ئەو خوێندنگایەو ماڵی مەلا ئەحمەد خۆی، ئۆتێلو دووکانەکانی حاجی «برایم ئاغا»یە. زانایانی بەناوبانگی وەك مەلای «پێنجوێنی»و «موفتی

---

(١) مەلا حسەین، لە شیعریشدا دەسێکی باڵای بووە، ئەمە نموونەی شیعریەتی:

یاقووتە لەبی لەعلت، یا قووتی رەوانی دڵ

رەشمارە سەری زوڵفت یا خود «رەشە» مارێکە...

زەهاوی»و شێخ «ئەحمەد»ی «فائز»، لای ئەو زاتە خـوێندوویانە. لە "١٢٥٥"دا بووە بە «رئیس المُـدرِّسین»ی سـلێمانیو لە "١٢٧٩"دا پایەی موفتییەتی دراوەتێ؛ وە لە «رەجەب»ی "١٢٨٨"دا لە «حیجاز» کۆچی دوایی کردووە.

لەپاش وەفاتی «چاومار» حاجی مەلا «ئەمین»ی کوڕی جـێگای ئەگرێتەوەو لە "١٣٠٣"دا بووە بە حاکمی سلێمانی، وە لە "١٣٠٨"دا بووە بە موفتیو مەدالیـەی مـەجیدی دراوەتـێو کـراوە بـە وەکـیلی دائیرەی «مەشێخەتی ئیسلامی» لە سلێمانیدا. ئەم زاتە لە "١٣١٥"دا کۆچی دوایی کردووە. گەلێك نووسراوی بەنرخی هەیە.

پاش حاجی مەلا ئەمین، مەلا «عبد العزیز»ی کوڕە گەورەی ئەبێ بە موفتی سلێمانی، کە لەو کاتەدا تـەمەنی "٢١" سـاڵان بـووە، بـەڵام پایەیێکی زانستی بەرزی بووە. وە هەر بەهۆی ئەو پایەی زانستیەیەوە کراوە بە ئەندامـی کـۆڕی زانـیاری «المـجمع العـلمی»ی دەوڵـەتی عوسمانیو مەدالیەی مەجیدی پێ دراوە، وە گەلێ ئەرکی گەورەتری پێ سپێراوە؛ وەك: سەرۆکـایەتی ئـەنجومەنی مـەعارفی سـلێمانیو حاکمیەتیو وەکالەتی دائـیرەی مـەشێخەتی ئـیسلامی لە دەوڵـەتی عوسمانیدا کە مەرکەزەکەی لە «ئەستەموول» بووە. هەروەها بـەهۆی پـایەی زانسـتییەوە کـاربەدەستانی دائـیرەی مـەشێخەتی ئـیسلامی ویستوویانە لە خۆیانی نزیك خەنەوەو لە "١٣١٨"دا کـردوویانە بـە موفتی «بۆرسە» بەڵام نەچووە. وە لە "١٣٢٠"دا کردوویانە بە موفتی «ئەدرِنە»، بەڵام ئەوەشی نەویستووە.

کــە ئــینگلیزەکــانیش ســـلێمانییان داگـیر کـرد، مـوفتی بـە بەربەرەکانێیەکـی تـوندی کـردن. لەبـەر ئـەوە بـە تـوندی لەگـەڵی جووڵاونەتەوەو هەموو ئەو فەرمانانەیان لێ سـەندووەتەوە کـە پـێی سپێررا بوو.

پاش دامەزرانی حکوومەتی خۆماڵیش، موفتی هەر بەردەوام بوو لە بەجێ هێنانی ئەرکە ئایینییەکانی سەرشانیدا بۆ خزمەتی ئیسلامو موسوڵمانان، وە سەردەمێك سەرۆکی کۆمەڵی «الهدایة الاسلامیة» بوو لە سلێمانی.

ئەم زاتـە لە "٥"ی شـەشەڵانی "١٣٦٦"ی هـیجری، رێکـەوتی ١٩٤٧/٨/٢٠دا ئەم جیهانەی بەجێ هێشت.

«بێخود»یش لە "١٢٩٦"دا هـاتووەتە دنـیاوە[1] و لای زانـایانی ناوداری ئەو سەردەمەی سلێمانی خـوێندنی تـەواو کـردووە. وە لە ساڵی "١٩٠٠"دا کراوە بە حاکمی «هەڵەبجە»و لەگەڵ مـامۆستایانی خوالێ خۆش بوو «رەفیق حیلمی»و «زێوەر»دا مامۆستایەتی کردووە، بێ ئەوەی بەرابەر بەوە هیچ مانگانەیێك وەربگرێ.

پێش کۆچی دوایی موفتی کاکی، چەند ساڵـێکی لە هـەڵەبجە بـە سەربردووە. ئەوجا گەڕاوەتەوە سلێمانی، وە تا مردنی لە جێگاکەی ئەودا موفتی بووەو سەعات "سـێ"و چـارەکـێکی پـاش نـیوەڕۆی

---

(١) ساڵی لە دایك بوونی «بێخود» بـە حـیسابی ئـەبجەد ئـەکـاتە ئـایەتی: ﴿عَسىٰ أَنْ يَبْعَثَكَ رَبُّكَ مَقاماً مَحْمُوداً﴾

١٩٥٥/٨/٢٥ «١٣٧٦ی هیجری» بۆ یەکجاری سەری ناوەتەوە. بە کۆچی دوایی ئەم زاتە سەرچاوەیێکی تری شیعری کلاسیکی کوردی وشك بوو...

لە رۆژی "چلە"یدا ئاهەنگێکی گەورە بەرپا کرا بۆ بیرکردنەوەی؛ شاعیرانو نووسەرانی کورد، لەو ئاهەنگەدا بەشدار بوونو بە شیعرو وتاری جوان یادی «بێخود»یان زیندوو کردەوە. ئومێدمان وایە بتوانین لە هەلێکی نزیکا ئەو شیعرو وتارانەش کۆکەینەوەو لە چاپیان بدەین.

***

# پیتی ئەلف

- ١ -

غەزاڵی خۆش خەرامی من، کە تورڕە ئینتیشار ئەکا[١]
هەزاران شێری سەف شکەن بە رشتەیێ شکار ئەکا[٢]
کە تیری غەمزە تێژ ئەکا، لە جەرگ‌و سینە کار ئەکا
کە قامەتی بەدەر ئەخا قیامەت ئاشکار ئەکا
چ قامەتێ؟ بە راستی لە سەروی جۆیبار ئەکا

فیدای دولبەرێ ئەبم کە عەینی دڵڕوباییە[٣]
غولامی سەروەرێ ئەبم کە فەخری پادشاییە
کە رۆژی هیجری ماتەمەو شەوی ویساڵی شاییە
کە سەد هەزاری وەك منی بە جان‌و دڵ فیداییە
نە من کە نەقدی جان‌و مۆڵك لە رێی ئەوا نیسار ئەکا

---

(١) خۆش خەرام: خۆش رەوت. تورڕە: [طرّە]، زوڵف.
(٢) رشتە: تاڵ. (٣) دڵڕوبایی: دڵ رفێنی.

لە گوڵشەنی نوبووەتا گوڵێکی نەو دەمیدەیە(١)
لە قولزوومی ریسالەتا دورڕێکی کەس نەدیدەیە(٢)
لە بورجی چەرخی عیززەتا مەهێکی بەرگوزیدەیە(٣)
هەزار شاهو حاکمی غوڵامی زەڕ خەریدەیە
کەسێکە موعجیزەی ئەسەر لە وردە بەردو دار ئەکا

گەدایی بارەگاهی ئەو ئەگەر ئەمیر، ئەگەر وەزیر
فیدایی عیززو جاهی ئەو ئەگەر غەنی، ئەگەر فەقیر
مەپرسە خەرقی عادەتی شەهەنشەهی فەلەك سەریر
ئەگەر لە فەیزی ئەو نەبێ دوو هۆقە «جۆ»و یەك «چتیر»
چلۆن لە رۆژی خەندەقا کیفایەتی هەزار ئەکا(٤)

موتیعی ئەمرو نەهی ئەو مولووکی سەرکەش‌و بزێو
ئەسیری قەهرو لوتفی ئەو سیباع‌و وەحشی دەشت‌و کێو
نیگاری دڵ شکاری من لە هەر فەرازو هەر نشێو
کە پەردە لابدا لە روو بە بۆیی زوڵف‌و خەددو لێو
لە رایحەی بەهەشت ئەکا، لە نوور ئەکا، لە نار ئەکا

---

(١) نوبووەت: «نبوّت»، پێغەمبەرایەتی. نەو دەمیدە: تازە پشکووتوو.
(٢) قولزووم: [دەلیا، دەریا] کەس نەدیدە: کەس نەدیتوو.
(٣) مەه: مانگ. بەرگوزیدە: هەڵبژاردە.
(٤) ئەگێڕنەوە پێغەمبەرﷺ لە غەزای «خەندەق»دا بە "دوو" هۆقە جۆر چتیرێك، نانی "هەزار"کەس لە یارانی غەزاکەری داوە.

لە ئەووەڵو لە ئاخرا مەداری ئەنبیایە ئەو
لە باتینو لە زاهیرا حەبیبی کیبریایە ئەو[(١)]
کە چونکە لای خودا قسەی بە راستی رەوایە ئەو
دە موژدە بێ لە ئوممەتی کە گەورەیێکی وایە ئەو
لە رۆژی مەحشەرا تکای هەموو گوناهکار ئەکا

پەیەممەرێ کە باعیسی وجوودو خەلقی عالەمە
کە تاقە سواری عەرسەیی شەفاعەتەو موسەللەمە[(٢)]
کە زامو هیجرو میحنەتی سروورو وەسڵو مەرهەمە
لە هەفت خوانی سینەدا موژەی خەدەنگی رۆستەمە[(٣)]
لە فەتحی «خەیبەر»ی دڵا برۆی لە «ذوالفَقار» ئەکا

---

(١) کیبریا، «کِبریاء»: مەبەست زاتی خوایە.
(٢) موسەللەمە: واتە ئەم قسەیە باوەڕی پێ کراوە.
(٣) هەفت خوان: کاتێ کە کەیکاوس کەوتبووە بەندی «مازیندەران»ەوە رۆستەم چوو بۆ رزگارکردنی، لە رێگادا چەند دێوو جادووی کوشت، وە بە "حەوت" رۆژ خۆی گەیاندە مازیندەرانو کەیکاوسی رزگار کرد. مەبەست لە هەفت خوان «حەوت خوان» ئەمەیە، واتە هەر رۆژە دێو کوشتنێکی خوانێك بووە رازاندوویەتەوە.
[هەفت خوان: حەوت قۆناغ، کە رۆستەم بڕیویەتیو لەگەڵ ئەم حەوت شتە: «شێر، تینوویەتی، ئەژدیها، ژنە جادوگەر، ئەولادی دێو، دێوی سپی» شەڕی کردووە تا گەیشتووەتە کەیکاووسو رزگاری کردووە.]

شەها بە غەیرەتت قەسەم دەمێکە دیلە ئوممەتت
بە دەس «عَدوّ»ی دینەوە عەجەب زەلیلە ئوممەتت
لە خەستەخانەیی غەما وەها عەلیلە ئوممەتت
بە چیهرە زەردی‌یا ئەڵێی دوچاری «سیل»ە ئوممەتت
دەوایی رەحم‌و لوتفی تۆ هەمیشە ئینتیزار ئەکا

خۆش ئەو دەمەی کە رۆژو شەو تەواف ئەکا رەواقی تۆ
خۆش ئەو سەرەی کە کەوتبێ لە کووچەوو سوقاقی تۆ
بە تیکە تیکە بێ دڵێ کە نەیبێ ئیشتیاقی تۆ
حەیاتی من ویساڵی تۆ، مەماتی من فیراقی تۆ
بەڵێ پەری خەیاڵی تۆ عیلاجی شێت‌و هار ئەکا

دەمێکە چاوەڕێیەتی گیان‌و دڵ ویساڵی تۆ
ئومێد ئەکا کە دەرکەوێ لە پڕ مەهی جەماڵی تۆ
ئەگەر لە ئاینەی منا دەمێ نەبێ میسالی تۆ
شکەستە بێ بە بەردی غەم بە جاهی سەحب‌و ئالی تۆ
کە ئاسمان وەکوو زەمین بەوانە ئیفتیخار ئەکا

خوسوس خەلیفەیی یەکەم، رەئیسی فیرقەی ئیهتیدا
کە ئەو بوو کردی رۆحی خۆی لە رێی سەداقەتا فیدا
کەسێ کە پێی موبارەکی بخاتە ژاری ئەژدەها[(١)]

---

(١) مەبەست لەوەیە کە حەزرەتی «ئەبوبەکر»ﷺ لە ئەشکەوتی «ثَور»دا بە پەنجە کونە مارێکی گرت‌و مارەکە پێوەی دا.

لەبەر ڕەسوولی موحتەرەم نەوەك گەزەندی پێ‌بگا
یەقین بزانە ئیشی وا لە ئیشی یاری غار ئەکا

لە پاش ئیمامی نامەوەر «عومەر» خەلیفەیی زەمین
درەختی مەعدەلەت سەمەر، چەمەن تیرازی شەرع‌و دین
نە هەر لە عەسری عەدڵی‌یا مەڕەو لە گورگ ئەبێ ئەمین
لە جێگەیێ جەنابی ئەو کە بوو ئیتر سەگی لەعین(١)
لە ترسی شێری هەیبەتی بە لوورەلوور فیرار ئەکا

لە وەسفی خازینی سووەم یەگانە گەوهەری حەیا
ئیمامی مەجمەعی ئەدەب، خەتیبی مینبەری حەیا
هەرچی بڵێم خەجاڵەتم لە شەرمی جەوهەری حەیا
کەسێ کە دابخا فەلەك لەڕێی ئەوا سەری حەیا
هەزاری وەك من‌و مەلەك بە باسی سەر مەزار ئەکا

لەگەڵ کەسێ حەبیبی خۆی خواکە بووی عینایەتی
بەیانی وەسفی ئەو ئەکا لە ﴿هَلْ أَتىٰ﴾ بە ئایەتی(٢)

---

(١) سەگی لەعین: مەبەست لە شەیتانە کە ئەڵێن: جارێکیان حەزرەتی «عومەر»ﷺ گرتوویەتی‌و بەستوویەتیەوە بە کۆڵەکەی مزگەوتەوە.
(٢) ئایەتی ﴿وَ يُطْعِمُونَ الطَّعَامَ عَلىٰ حُبِّهِ مِسْكِيناً وَ يَتِيماً وَ أَسِيراً﴾ بۆ باسی ئەو هاتووە واتە: لەگەڵ ئەوەشا کە خواردەمەنی زۆر خۆشەویستە، ئەم یارانەی پێغەمبەرﷺ دەرخواردی هەژارو هەتیوو دیلی ئەدەن.

بەڵێ غەزەنفەرێکی وا کەوا درا هیدایەتی
لە ڕۆژی فەتحی خەیبەرا بە زۆری شانو رایەتی
بە دەستو تێغی هەڵمەتی لە شێری کردگار ئەکا

مەپرسە جاهو حیشمەتی دوو بێچوە شێری حەیدەری
لە خادیمێکی بێشەیان چ سوونیو چ جەعفەری
شەقێن ئەکا بە سەد سەری «قوباد»و تاجی قەیسەری
هەتا نەچیتە «کەربەلا» گران ئەزانی ئەی پەری
کە کۆمەڵی مەلەك لەوێ لە قافڵەی «زُوّار» ئەکا

لە «بێخود» ئەر سوئال ئەکەن کە چۆنە چاکە سیحەتی؟...
بە دەردی عەشقی لەیلەوە نەماوە هێزو قووەتی[١]
بە ناڵە ناڵی گەرمیا، بە ئاهی سەردی حەسرەتی
بە ئەرخەوانی ئەشکیا، بە زەعفەرانی سوورەتی
لە چۆڵی بێ‌نەواییا، لە قەیسی لەش بە بار ئەکا[٢]

بە دەس هەوا و نەفسەوە ئەگەرچی بەندە موبتەلام
هیلاکی باری مەعسیەت، کەلاکی دەردی بێ دەوام
بەڵام ئەمەم کیفایەتە کە نەعت خوانی «موستەفا»م

---

(١) لەیل: «لَیل» بە حیسابی ئەبجەد بەرامبەری «یس»ە کە ناوی پێغەمبەرە ﷺ.
(٢) «قەیسی لەش بە بار»و «مەحموودی بێخود» هەریەکە بە حیسابی ئەبجەد ئەکەنە ٧٣٠.

خۆلاسە من لە هەردوولا کەسێکە مەلجەئو پەنام
کە گفتوگۆ بە وەحشیو غەزاڵو سووسەمار ئەکا[١]

هەزار شوکرو سەد سەنا کە غونچە واگەشایەوە
بە بۆی نەسیمی لوتفی حەق گرێی لە دڵ کرایەوە
بروودەتی هەوایی غەم لەسەر زەمین بڕایەوە[٢]
لیوایی شادیو فەرەح بە جارێ هەڵ کرایەوە
موقەددیمەی شکۆفە هەر لە شاهی نەوبەهار ئەکا

هەتا تەجەللیی خودا لە عالەما بکا زوهوور
بە ئاگری گوڵی چەمەن چیا ببێتە کێوی «توور»[٣]
فریشتەو ئادەمی ئەڵێن هەتا ئەبەد لە خوارو ژوور...
سەلاتی حەق لەسەر شەهێ کە شەق ئەکا قەمەر لە دوور
سەلامی حەق لەسەر مەهێ کە ئەسپی خۆر لە غار ئەکا[٤]

١٣٦٠ هـ

---

(١) ئەمانە بە «موعجیزە» قسەیان لەگەڵ پێغەمبەرﷺ کردووە.
(٢) بروودەت «برودة»: ساردی.
(٣) ئیشارەتە بەوە کە لەسەر داوای حەزرەتی «موسی»علیه السلام کێوی «طور» بوو بە جێگای تەجەللای نووری خواو کێوەکە سووتا.
(٤) ئەگێڕنەوە ئێوارەیێك لەوانەبوو نوێژی عەسری پێغەمبەرﷺ بفەوتێ، بەڵام خۆر لەبەر ئەو راوەستاو ئاوا نەبوو تا نوێژەکەی عەسری کرد. ئەم قەسیدەیە لە ساڵی ١٣٦٠ی کۆچیدا دانراوە کە بە حیسابی ئەبجەد بەرامبەری «مدد یا فخرالمرسلین»ە.

- ٢ -

دیسان چەمەن لە «ڕَوضە»یی خولدی بەرین ئەکا
گوڵ خونچە هەم لە لێوو دەمی حووری عین ئەکا[١]
ئاخۆ چ مانییێکە کە سەحراو شاخ‌و داخ
ژەنگارو زەردو سوورو سپی‌و سەوزو شین ئەکا[٢]
بەربووکی نەوبەهارە بە ئەنواعی ڕەنگ‌و بۆ
ئارایشی کچانی گوڵۆکی زەمین ئەکا
ناگا بە سەروی قامەتی ئەو شۆخە ئاهی من
ئەو لەنجەیەی سەبا بە قەدی یاسەمین ئەکا
بۆ دەفعی ژانە سەر ڕەشە ڕێحانە یەك چڵی
کاری هەزار سەندەل‌و سەد موشکی چین ئەکا
ڕۆح بۆ نەکا فیدایی سەبا بولبولی فگار
هەر تاقە سروەیێکی دەوای سەد برین ئەکا[٣]
بولبول خەریکە تەوقی سەری هەڵکەنێ بە چنگ
گوڵچین کە دێتە باخ‌و تەمای گوڵ چنین ئەکا

(١) خولدی بەرین: بەهەشتی کۆن یا بەرز. حووری عین: حۆرییە سپییەکان.
(٢) مانی: هونەرمەندێکی ئێرانی بووە لە سەردەمی ئەردەشێری پێشدادیدا [لە سەردەمی شاپووری «ذوالاکتاف»دا ژیاوە. (شانامەی فیردەوسی)]. ژەنگار: ژەنگی سەوزی تێر.
(٣) فگار: دڵ بریندارو زوێر.

زاهید کە سەیری پەرچەمی سونبوڵ ئەکا ئەڵێ...
ئەم رشتە بادراوە لە «حَبلُ المَتین» ئەکا[١]
هەر فەجری کازیبەو کە ئەشوبهێ بە زوڵفی یار
هەر سوبحی سادیقەو لە بەیازی جەبین ئەکا[٢]
هەر لالەیەو میسالی شەفەق سوور ئەچێتەوە
هەر ژاڵەیەو لە ئەنجومی چەرخی بەرین ئەکا
هەر بەردی جۆیبارە سپیو سافە وەك سەدەف
هەر شەونمە لە دانەیی دوڕڕی سەمین ئەکا[٣]
هەر یاکەریمی قومرییە تەئسیر ئەکا لە دڵ
هەر زیکری عەندەلیبە لە ناڵەی حەزین ئەکا
هەر تەیرو توورە وەك من ئەخوێنن لە خۆشیا
هەر باخەوانە ئارەزووی هەڵپەڕین ئەکا[٤]
ئەی باخەوان مەزانە کە زستان گەڕایەوە
موژدەم بەرێ کە بۆ چلە ئەم بەفرە شین ئەکا
ئەم شاییو سروورە لە شەوقی بەهارە، یا...
عەشقی گوڵێکە عەفووی هەموو موزنیبین ئەکا؟

---

(١) «حَبلُ المَتین»: پەتی ئەستوور. لێرەدا مەبەسی لە پەیوەندی وەفای نێوانی «ئەهلی تەسەووف»ە.
(٢) فەجری کازیب [فجر کاذِب]: بەیانیە درۆزنە. فەجری سادیق [فجر صادِق]: رۆژ بوونەوەی بەڕاستی. بەیازی جەبین: سپیایی ناو چاوی یار.
(٣) سەمین: گرانبەها. (٤) توور: «طیور» باڵندەکان.

زاتـــێکی وا بـــە ڕەحـــمە لە ڕۆژی شـــەفاعەتا
هەرچی جەهەننەمی هەیە جەننەت نشین ئەکا
ڕۆح فەرشی ڕێی کەسێکە کە مەجمووعی کائینات
بۆ پێی موبارەکی لە پەڕەی دڵ سەرین ئەکا
پـــێغەمەرێکە لێـــرەوە تـا عـەرشی ئیزەدی
تەیی ئەوەندە ڕێگە بە یەك دەم یەقین ئەکا
خـورشیدی مەحز ئەگەر نیە یاران لە ئایەتا
ناوی شەریفی بۆچی خودا «یێ»و «سین» ئەکا(١)
قـوربانی ئەو خـوایە کە تیفلێکی بێ پدەر
ساحێب سوپا و رایەتو تەختو نگین ئەکا(٢)
قـوربانی ئەو خـودایە کە دوڕڕێکی وا یەتیم
بۆ شەوچرای ئێمە لە «ماء»و لە «طین» ئەکا(٣)
ئیحیای مەسیح ئەگەر نەفەسێ بوو، جەنابی ئەم
تا ڕۆژی ﴿يَوْمَ يُنْفَخُ﴾ ئیحیایی دین ئەکا(٤)

---

(١) بە یەکێك لە زاراوە «لَهجە»کانی عەرەب «یس» ناوی خۆرە.
(٢) پدەر: باوك. رایەت: بەیداخ.
(٣) ئیشارەتە بەوە کە ئادەمیزاد لە قوڕ دروست کراوە.
(٤) ئیشارەتە بە ئایەتی ﴿يَوْمَ يُنْفَخُ فِي الصُّورِ﴾ واتە: ئەو ڕۆژەی کە فوو ئەکرێ بە کەڕەناکەدا، کە ڕۆژی قیامەتە.

«حەسسان» بە یادی قامەتی مەوزوونی ئێستەکەش
گەر تێ بگەی لە مەسرەعی ئاهو ئەنین ئەکا[(١)]

چۆن خەتمی نەعتی ئەو بە من ئەکرێ کەوا خوا
هەر بەو رەسوولە خەتمی هەموو مورسەلین ئەکا

«بێخود» لە فەیزی نەعتی «علیه السّلام»ەوە
هەرکەس کەلامی تۆ ببیێ ئافەرین ئەکا[(٢)]

***

---

(١) حەسسان: «حَسّان بن ثابت» شاعیری پێغەمبەرﷺ. ئەنین: ناڵە.

(٢) ببیێ: ببیسێ.



# پیتی تێ

- ١ -

ئەوا ئەی شەمعی بەزمئارایی دین، پەروانەکەی خۆت هات
بە شوعلەی ئاگری رووت جەرگو دڵ بوریانەکەی خۆت هات(١)
لەبەر دەردی موخالیف بێ‌نەوا وەك نەی ئەناڵێنم
بە شۆری شەوقی تۆوە سینە پڕ ئەفغانەکەی خۆت هات
بە ئومێدی شەکەر خەندێ لە خونچەی لێوی شیرینت
بە لالەی ئەشکەوە وا دیدە پڕ گریانەکەی خۆت هات(٢)
بە گۆزەی پڕ لە ئاوی دیدەوو گەسکی موژە قوربان
لەبۆ تەنزیفی رێگەت خادیمی ئاسانەکەی خۆت هات(٣)

---

(١) بەزمئارا: ئەوەی کۆڕی رابواردن ئەڕازێنێتەوە.
(٢) لالە: گوڵی سوور. (٣) ئاسانە: «ئاستانە»، بەردرگا.

ئــــیتر بــۆ خــاتری ریشــی ســپی شــێخی «ضـیاء الدیــن»
عیلاجێ! روو رەشم، مـوستەغریقی عـیسیانەکـەی خـۆت هـات
لە ئــیکسیری نـیگاهت. مشـتە خـاکـێ مـن نـەکـەی مـەحرووم
کە بۆ رەمزێکی چاوت بێ سـەرو سـامانەکـەی خـۆت هـات(١)
ئــەمن «قِــطمیر»ی ئــێوەو ئــێوە «أصــحاب الرَّقــیم»ی مــن
لەبۆ کـەهفی ئـەمانت وا سـەگـی دەرگـانەکـەی خـۆت هـات(٢)
فـیدات بــم بــێ خــەڵاتی مـەعنەوی ئـەم جـارە قـەت نـاڕۆم
بە هەدیەی نـەعتی تـۆوە وا قـەساید خـوانـەکـەی خـۆت هـات
بــە فــیکری ئــیلتیفاتی ئــاسکەکــەی شـێر ئـەفگەنی چـاوت
بە دەشتی شارەزوورا «بـێخود»ی دێــوانـەکـەی خـۆت هـات(٣)

---

(١) ئیکسیر: ئەو خۆڵەی کەکیمیاگەرەکان ئەیکەنە ناو مسەوەو ئەبێ بە زێڕ.
(٢) قِطمیر: سەگی «اصحاب الكَهف». «اصحاب الرَّقیم»: هـەندێك ئـەڵێن «اصحاب الکهف»ن کە "حەوت" کەس بوون چـوونە ئـەشکەوتێکـەوە لە سەردەمی «دەقیانووس»دا، بۆ ئەوەی خۆیان رزگار کەن لە چەوساندنەوەی ئایینی، وە لەوێ خەویان پیا کەوت؛ کە بێدار بوونەوە یەکێکیان نارد بۆ شار خواردنیان بۆ بکڕێ، لەوێ بە پارەکەیان دا دەرکەوت کە چەندسەد ساڵیان بەسەرا رۆیشتووە. هەندێکیش ئەڵێن "سێ" کەسن چوونە ئەشکەوتێکەوە نووستن؛ تاشە بەردێك تـل بـووەوە دەرگـای ئـەشکەوتەکـەی لێ گـرتن، یەکێکیان وتی: با لە خوا بپاڕێینەوەو هەرکاممان باشترین ئیشی خۆی بکا بە تکاکار بۆ رزگار بوونمان، بەو جۆرە بە تکای هەرکامێکیان کەلەبەرێکیان بۆ کرایەوە تا رزگار بوون.
(٣) شێر ئەفگەن: شێر رمێن. «بێخود» ئەم قەسیدەیەی بۆ خـوا لێ خـۆش بوو شێخ «نَجم الدّین»ی بیارە وتووە.

- ٢ -

مەڵێ ئەی «نازەنین» بۆ شاری «کۆیە» کاکی «ئێران» هات
بفەرموو عەسکەری لەشکەر شکێنی شاهی گەیلان هات(١)
مەڵێ عەسکەر، بڵێ سەر عەسکەری سوڵتانی دین یەعنی...
غولامی شاهڕاهی بارەگاهی قوتبی یەزدان هات
چیە یا ڕەب کە ناوی «کاك» ئەبەن زاهیر دەبێ شەوقم
دەڵێ بۆ زەڕڕەیێکی بێ نەوا خورشیدی ڕەخشان هات(٢)
دەمێ بوو «سافی»یا نادیدە دڵ بووبوو بە پەروانەت
بە کامی خۆی گەیی بیستی کەوا شەمعی شەبوستان هات(٣)
دەمێ بوو چاوەڕێی موژدەی قودوومی ئێوە بوو «بێخود»
خودا کردی نەسیمی پیرەهەن بۆ پیری کەنعان هات(٤)

***

---

(١) «ئێران» یا « هێران»و «نازەنین» دوو دێن لە خۆشناوەتی. لێرەدا لەسەر شێوەی «تَورِیە» [یا «ایهام»] ئەم دوو وشەیە بەکار هێنراوە. «کاك» لەقەبی بنەماڵەی شاعیر «سافی هێرانی»یە.

(٢) بێ نەوا: هەژار. ڕەخشان: تیشکدار.

(٣) شەبوستان: تاریکە شەو، شەواوا.

(٤) قودووم: هاتن. پیرەهەن: کراس. پیری کەنعان: حەزرەتی یەعقووب عليه السلام. بێخود ئەم قەسیدەیەی بۆ «سافی» شاعیری هێرانی وتووە.

- ٣ -

ئەی ساحەتی سەد جەننەت، دەشتی عـەرەبوستانت
نادەم بە هەزار گوڵشەن، یەك خاری مـوغەیلانت(١)
بـۆ لالەیـی نـوعمانت، داغـداره دڵو جـەرگم
داغـداره دڵو جـەرگم، بۆ لالەیی نـوعمانت(٢)
بـێ پـەڕتەوی روخسـارت تـاریکه دڵـی حـیربام
بـەم زەڕڕەیـه بـنوێنه، خـورشیدی درەخشـانت(٣)
بـۆ سـەروی خـەرامـانت وەك قـومری ئـەناڵێنم
وەك قـومری ئـەناڵێنم بـۆ سـەروی خـەرامـانت
عەقڵو خیرەدی بردووم نـەشئەی قـەدەحی چـاوت
پێوەندی هـەوای کـردووم تـای زوڵـفی پـەرێشانت
مـیحرابـی دڵو جـانه، هـێزی دەسـی ئـیمانه
عـاسایی خـەتیبانه، شـمشێری خـۆراسـانت
بـەو قـیبلەیی ئـەبرۆیه، رۆح گـەر لە قـەزای کـۆیه
دڵ خـادیمی لای تـۆیه، سـەر گـۆیه لە مـەیدانت
خـاقانه گـەسك لێـدەر، بـۆ خـادیمی بـەرقاپیت
خوددامه بە رۆح قەیسەر، بۆ بان گوشی سـەر بـانت

(١) خار: دڕك. موغەیلان: دارێکی دڕکاوییه.
(٢) لالەیی نوعمان: گوڵی «شقائِق النّعمان».
(٣) حـیربا: بـاڵنـدەیەکـە وەك رۆژگـار پـەرست هـەر بـە دەوری رۆژا ئەسووڕێتەوە.

ئەی سـەییدی مـەخلووقان ئـاگـات لە ئـیمانی بـێ
ئەو ساتە کە بوو قـوربان، ئـەم عـەبدە بـە قـوربانت
تۆ سیدرە نشـین بـازی، سـاحێبی سـەد ئـیعجازی
پـێغەممەری مـومتازی، دەسـتی مـن‌و دامـانت(١)
قـورئانی نـوعووتی تـۆ، خـەتمی بـە بـەشەر نـایێ
«بێخود» چیە یا حەسسان، جـیبریلە سـەنا خـوانت

***

---

(١) سیدرە: «سِدرَةُ المُنتَهیٰ»، شوێنێکە لە ئاسمانا.



# پیتی حێ

- ١ -

ئـارەقم کـردو نـەجاتی هـەر نـەدام دەردی گـوناح
لەرزو تـاداری خـەجاڵەت خـۆم‌و روو زەردی گـوناح
گەییيە چەرخی مەعریفەت وێڵداشی من خـاکـم بـەسەر
من حەمامۆکێ ئەکەم هێشتا لەسـەر عـەردی گـوناح[1]
مشـتە تـۆوێ دانـەوێڵەی چـاکـە شك نـابەم کـەچی
دائـیمەن هـەڵگێڕو وەرگـێڕی ئـەکـەم وەردی گـوناح
وەك کـەسێ لایـدا لە رێ حـۆلی بـیابان وا مـنیش
نەفسی بەد پێم تەی ئەکا ئەم هەردو ئـەو هـەردی گـوناح

---

(١) وێڵداش: ئاوەڵ، هەڤاڵ، وشەیەکی تورکییە. حـەمامۆکـێ: یـارییەکـی منالانەیە.

چوومە ناو بـێشەی چـوغوردی زۆر خـیلافی شـەرعەوە
قەت لە شێری حەق نەترسام وا ئەبێ مـەردی گـوناح[(١)]

هیچکەسێ وەك من لە حەپسی شەشدەری یەئسا نەهێشت
ئـاسمان وەخـتێ فـرێیدا بـۆ زەمـین نـەردی گـوناح

دەك فەڵەك دەستت شکێ بەر تیری قەهری حـەق کـەوی
هەروەکوو شـووشەی مـنت وا دایـە بـەر بـەردی گـوناح

ئەی خـودا گـەر مشتو مـاڵی لوتـفی تـۆ چـاری نـەکـا
ئەی خودا وەك خـۆرە ئـاوێنەی دڵـم گـەردی گـوناح[(٢)]

دێـڕ بـە دێـڕ کـەشکۆڵو دیـوانـی هـەموو عـالەم گـەڕام
تیا نەبوو «بێخود» وەکوو من مونتەخەب فەردی گوناح[(٣)]

***

---

(١) بێشە: توونو چڕ. چوغورد: پڕ لە دارو دەوەنو شەخەڵ.
(٢) مشتو مـاڵ: دەست سڕینو پاك کـردنەوە. گـەردی: گـەردەکـەی، تۆزەکەی سەری.
(٣) مونتەخەب فەرد: تاقە شیعری هەڵبژاردە. ئەم پارچە شیعرە لە ساڵی ١٣٤٨ی هیجریدا وتراوە کە بە حرووفی ئەبجەد ئـەکـاتە: «بـدل ترجُمان حَقیقت - بە دڵ تەرجومانی حەقیقەت».



# پیتی دال

- ١ -

«طُوبىٰ لِمَنْ» كه رۆحی فیدای ئەو نیگارە كرد
خۆی بادەنۆشی نەشئەیی ئەو چاو خومارە كرد[١]
«طُوبىٰ لِمَنْ» كەوا سەرو مالّی بەڕاستی
شاباشی خاكی ئەو بەرو بووم‌و دیارە كرد
«طُوبىٰ لِمَنْ» كەوا بە ئومیدی قودوومی یار
بـرژانگی گەسكی جادەیی ئەو شەهسەوارە كرد
خۆزگەم بەوەی كە پۆڕی دڵی خۆی بە سەد نیاز
نێچیری ئەو عوقابی مەلایك شكارە كرد[٢]
خۆزگەم بەوەی كە موددەتی عومری بە نەقدی جان
باخی نوعووتی شاهی مەدینەی ئیجارە كرد

---

(١) «طُوبىٰ لِمَن»: خۆزگە بەو كەسە.
(٢) عوقاب: هەڵۆ. شكار: راو.

خـــۆزگەم بـــەوەی کـــەوا لە پـــەنای ئـــەو شـــافیعەدا
قـــــازانـــــجی لەو نـــــەمام و گـــوڵ و لالەزارە کـــرد
قـــــوربانی ئـــــەو جـــەنابە کـــە بـــریانییێکی بـــەرخ
ئیزهاری زەهری خۆی وەکوو بـوو بـەو قـەرارە کـرد
بۆی بوو بە شیرو شەکـری شـیفا بـەخشی جـاویدان
سوودێکی وای لە چەشنی ئەو زەهری مـارە کـرد(١)
«بَـیْضا» بـە ئـەمری ئـەو بـوو کـە وەسـتا دەقـیقەیێ
دوو لەت بە دەستی ئەو بوو کە مانگی ئیشارە کـرد(٢)
ئـەو بـوو کـە وەك مـەلەك شـەوی ئـەسرا لە ئـاسمان
یەزدان تەوافـی مـەقدەمی بـەو حـەو ستارە کـرد(٣)
ئـــەو بـــوو کـــە یـەك چـتیرو مـەنێ جـۆ لە خـەندەقا
رۆژی غـــــەزا کـــــیفایەتیەو یـــــەك هـــەزارە کـــرد
تـەسبیح و نـاڵەی ئـەو بـوو کـە کـردی بـە دارو بـەرد
ئەو بوو قسەی بە ئـاسك و ئـەو سـووسەمارە کـرد(٤)

---

(١) ئـەگـێڕنـەوە ژنـە جـوولەکـەیەك زەهـری کـردبوو بـە گـۆشـتەوە بـۆ پێغەمبەرﷺ تا دەرخواردی بدا، بەڵام گۆشتەکە هاتە دەنگ و پێی وت کە زەهری پێوەیەو پێغەمبەر نەیخوارد.
(٢) «بَیْضاء»: خۆر.
(٣) ئەسرا: شەوڕەوی، میعراج. حەو: حەوت. ستارە: ئەستێرە.
(٤) ئـەگـێڕنـەوە وردە بـەرد لە نـاو دەسـتی پـێغـەمبەردا «سـبحان الله»ی کردووە، ئاسك و سووسەمار قسەیان لەگەڵی کردووە.

ئیعجازی ئەو بوو «ساریە» بیستی قسەی «عومەر»
مومتازی ئەو بوو ریفعەتی بەو یاری غارە کرد(١)
بۆچی نەبێ بە ساحێبی نوورەینی نەیرەین
«عوسمان» کە بۆنی دوو گوڵی لەو نەوبەهارە کرد(٢)
یادی بڕۆی رەسوولی خودا بوو بە یاوەری
«حەیدەر» کە فەتحی خەیبەری بەو «ذُوالفَقار»ە کرد
بڕوانە چۆن بە روتبەیی «مِنّا» خەڵات کرا
«سەلمان» کە هاتوو بەیعەتی بەو تاجدارە کرد(٣)
شافیع کە ئەو بێ، ئەهلی کەبائیر چ باکیە
با هەر بڵێن کە تێغی گونەهـ جەرگی پارە کرد(٤)
شوکری خودا کە رستی نەجاتی لە مل کرا
بۆ پاس ئەوەی کە خۆی بە سەگی ئەو هەوارە کرد

---

(١) ئەگێرنەوە لە غەزای «نەهاوەند»دا سەرکردەی موسوڵمانان «ساریة الكِنّانی» گەمارۆ درابوو، بەڵام بەخۆی نەئەزانی، حەزرەتی «عومەر»ﷺ لە مەدینەوە هاواری لێ کرد: «سارية، الجَبَلَ» واتە: خۆت پەنا بدە بە شاخەکە با تووش نەبی، ئەویش گوێی لێ بوو وە خۆی و لەشکرەکەی رزگار کرد.
(٢) نەییرەین «نَیِّرَیْن»: دوو رووناکەکە. بۆیە بە حەزرەتی «عوسمان» وتراوە «ذوالنُّورَیْن» کە "دوو" کچی پێغەمبەری هێناوە.
(٣) سەلمان: «سلمان فارسی» کە پێغەمبەر لە بارەیەوە فەرموویەتی: «سَلمانٌ مِنّا اَهْلَ البَیتِ» واتە: سەلمان لە خۆمانە، بنەماڵەی پێغەمبەرایەتی.
(٤) کەبائیر: «کبائِر» گوناهی گەورە.

کەعبەی نەجاحی هەردوو سەرای هات بە پیرەوە
هەرکەس کە چەشنی «رابیعە» ڕووی لەو تەلارە کرد(١)

«بێخود» بەقیعی غەرقەدی والایە مەرقەدی
«حاجی» ئەگەر مەزاری لەسەر «گردی یارە» کرد(٢)

دنیا ژنێکە فاحیشەوو پیاو کوژو گڵاو
وای ئەو کەسەی کە دێڵە سەگی وای مارە کرد(٣)

***

- ٢ -

کە حەججاجی فەلەك هاتو بە خوێنی غەم خەڵاتی کرد
بەسەر شێخو مەلادا دابەشی مووچەو بەراتی کرد(٤)

کەسم ئیمڕۆ نەدی بیخاتە سەر سەر چەرخو سوبحەینێ
وەها نەیدا بە عەرزا تۆ نەڵێی قەتعی حەیاتی کرد

---

(١) رابیعە: «رابِعَةَ العَدَوِیَّة» کە ژیانی خۆی تەرخان کردبوو بۆ خوا پەرەستی.
(٢) بەقیعی غەرقەد، «بَقیع الغَرْقَد»: گۆڕستانی مەدینە. حاجی: مەبەست لە حاجی تەوفیقی پیرەمێردە. گردی یارە: گردی مامە یارە.
(٣) ئەم پارچە شیعرە لە ١٣٧١ی هیجریدا دانراوە کە بە حرووفی ئەبجەد ئەکاتە «شەفیعمان ساحیبی اعجازە بێخود».
(٤) حەججاج: «حەجّاج»ی کوڕی «یوسف»، خوێنڕێژی بەناوبانگی ئەمەوییەکان لە عێراقدا.

لە ساداتی تەکیێ «عەبدولکەریم» نازانی شایێ بوو
کەچی فیلی ئەجەل هات‌و کشێکی کردو ماتی کرد
کە زانی نەشئەیێ نادا حەیاتی عاریەت بۆ کەس
ئەویش وەك باب‌و جەددی ئارەزووی بەزمی مەماتی کرد
«بِحَمدِ الله» لە دنیادا کە ئەوقاتی نەفیسەی خۆی
بە ئەکسەر سەرفی زیکری باقیاتی سالیحاتی کرد(١)
من‌و تۆی تووشی قەعری دۆزەخی هیجرانی غەم فەرموو
ئەگەرچی خۆی لە ئەوجی قەسری فیردەوسا سوباتی کرد(٢)
کە پرسیم سالی غوفرانی لە ئوستادی خیرەد «بێخود»
بە ئاهو نالە داوای قاقەزو خامەو دەواتی کرد
منیش لەوحەی دڵ‌و ئەنگوست‌و چاوم نایە بەردەستی
ئەویش «الحق» بە دیققەت سەنعەتێکی پڕ نیکاتی کرد
حورووفی موعجەمەی ئەم میسرەعەی نووسی بە تەئریخی
«جەوانمەردێ لە ئەشرافی تەکیێ ئەمڕۆ وەفاتی کرد»(٣)
١٣٥٣ ك

***

---

(١) نەفیسە: گرانبەها. باقیاتی سالحات، [باقیات صالحات]: کردەوەی چاك کە لەپاش مردن ئەمێنێتەوە. (٢) سوبات: دامرکانەوەو حەسانەوە.
(٣) ئەم پارچە شیعرە لە لاواندنەوەی شێخ «عبدالکریم»ی شێخ «محەممەد»ا وتراوە کە یەکێك بووە لە ساداتی تەکیەی «قەرەداغ»، وە لە ١٣٥٣ی هیجریدا کۆچی دوایی کردووە.

- ٣ -

«بِـــحَمدِ الله» لەســەر تــەعمیری مــزگەوتی «عــەبابەیلیٚ»
جەنابی شێخ «کەریم»ی ئالی شێخ «مەحموود» سـوباتی کـرد
بــە بـاڵی ﴿إِنَّـمٰا يَـعْمُرُ﴾ کـە گـەیە ئەو جـی ﴿مَـنْ اٰمَـنَ﴾
«امــان الله» له داخ ئــیحسانی ئــەو رۆحــی شکـاتی کـرد(١)
«أبــو صــادق» لەپــاش فــەتحی عــیبادەت خــانەیێکی وا
بە خەرقەی شاڵی تورمەی مـەغفیرەت یـەزدان خـەڵاتی کـرد
عورووجی چونکە حـەسری پیاوەتیو رەددی «مَـظالِم» بـوو
له عـــەرشی ئــیزەدیدا بــۆیە ئـیخلاسی ســوباتی کــرد
رەفـــیقان ســـاڵی تــەعمیرو وەفــاتی شـێخیان پـرسی
کە مەسجید کەی تەواو بوو؟ کەی ئەویش تەرکی حەیاتی کرد؟
موئەرریخ، یەعنی «بێخود» جەوهەری ئەم میسرەعەی فەرموو
«له دوای ئیتمامی ئەم مزگەوته زوو موحسین وەفاتی کـرد(٢)
لەبــاتی جــائیزەم بـەندەش دۆعـای عـەفووم ئـەویٚ یـەعنی
لەوەی لەم جــێگەدا تــەدریسو تــەهلیلو سـەڵاتی کـرد(٣)

(١) ئیشارەته به ئـایەتی ﴿إِنَّمٰا يَعْمُرُ مَسٰاجِدَ اللّٰهِ مَنْ اٰمَنَ بِاللّٰهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ﴾ واته: کەسێك ماڵی خوا ئـاوەدان ئـەکـاتەوە!، کـە بـاوەڕی بـە خـواو رۆژی قـیامەت بـبیٚ. امــان الله: «امــان الله خــان»ی والی «سـنه» کـە مـزگەوتی «دارالاحسان»ی کردووەتەوە. (٢) جەوهەری: نوختە دار.
(٣) ئـەم پـارچــە هــەڵبـەستە مـێژووی ئـاوەدان کـردنەوەی مـزگەوتی «عەبابەیلیٚ»و کۆچی دوایـی خـوا لیٚ خـۆش بـوو شـێخ «کـەریم»ی شـێخ

- ٤ -

پێنج خشتەکی «بێخود» لەسەر شیعری «فەوزی»

ئەی خودا، ئەی رافیعی نۆ سەقفی گەردوون، بێ عەمەد
نیعمەتت بۆ ئێمە «لایُحْصیٰ»، سیفاتت «لایُعَدّ»(١)
شوکر «لِلّه» تا دەوامی بێ لەگەڵ رۆحا، جەسەد
پڕ زمان‌و دڵمە یا رەب، ﴿قُلْ هُوَ اللّهُ أَحَد﴾
زیکرو فیکری زاهیرو باتینمە ﴿اَللّهُ الصَّمَد﴾

بێ کەس‌و بێ ماڵ‌و جاهم «یا رسول الله» دەخیل
زۆر فەقیرو بێ پەناهم «یا رسول الله» دەخیل
تۆی بە وەڵڵا «خضر»ی راهم «یا رسول الله» دەخیل
رێگە لێ ون بووی گوناهم «یا رسول الله» دەخیل
وا لە دەشتی چۆڵی عیسیانا خەریك ماوم مەدەد

تێکەڵی دنیای دەنی عەقڵ‌و دیرایەت ون ئەکا
سەیری مەلها سینەمای چاکەو عینایەت ون ئەکا

---



«مەحموود»ی عەبابەیلێیە، کە لە ١٣٧٤ی هیجریدا بوون، وە بە حیسابی ئەبجەد ئەکاتە حەرفە نوختەدارەکانی ئەم نیوە شیعرە «لە دوای ئیتمامی ئەم مزگەوتە زوو «محسن» وەفاتی کرد».

(١) عەمەد: [عَمَد]، کۆڵەکە. [«لاٰ یُحصیٰ»: حەسێب ناکرێت. «لاٰ یُعَدّ»: نایەتە ژماردن].

تۆزی بێ دینی عەجەب جادەی ویلایەت ون ئەکا
گێژەڵووکەی مەعسیەت ڕێگەی هیدایەت ون ئەکا
﴿لَمْ یَلِدْ﴾ ڕۆشن کە بەر چاوم ﴿وَ لَمْ یُولَدْ﴾ مەدەد

غەیری تۆ نیعمەت بە کەس کام پادشای «ذي شَأن» ئەدا
تاج و نەجمەی «لا»و «إلّا» بێ بەدەڵ نیشان ئەدا
ناوی تۆ سەروەت بە خاوەن ئیش و بێ ئیشان ئەدا
نەفی و ئیسباتە کە زیکری ڕێ بە حەق پیشان ئەدا
وا منیش ڕێبواری ئەو ڕێیەم خودا بمکەی بەڵەد

ئەو حەکیمانەی کە کەششافی هەموو وشک و تەڕن
موو شکافی نوقتە نوقتەی حیکمەتی بەحر و بەڕن[1]
عالمی دانا گەر ئەهلی چاکە یا ئەهلی شەڕن
مەشریق و مەغریب لە دەرکی زاتی تۆ کوێر و کەڕن
﴿لَمْ یَلِدْ﴾ وەڵڵا ئەزەل چەشتت، ﴿وَ لَمْ یُولَدْ﴾ ئەبەد

«فەوزی»یا وا رادیۆی لوتفی خودا بێ باتری[2]
هاتە سەر ئیخباری عەفوی تۆ، نیهان و زاهیری
تۆش لە غەزنەینی سەنادا لێدە تەپڵی نادری[3]

---

(١) موو شکاف: ئەوەی بە موو بسمێ. مەبەست لە زیرەکییە.
(٢) فەوزی: مەلا «عبد العزیز»ی موفتی براگەورەی «بێخود»ە.
(٣) غەزنەین: شارێکە لە «ئەفغانستان»، «نادر شا»ی هەوشار گرتی و تەپڵی سەرکەوتنی تیا لیدا.

عاقیبەت «مەحموود»ی کردی، چونکە «إخلاص» ئاخری
﴿لَمْ يَكُنْ لَهُ﴾ کاری پێك هێنای لەگەڵ ﴿كُفُواً أَحَد﴾

- ٥ -

سەحەر سپیاوی رووی ساماڵی «خورشید»
شەفەق سووراوی گۆنەی ئاڵی «خورشید»
گوڵی «بَیضا» بەیازی باخی سینەی
شەوی «یەلدا» سەوادی خاڵی «خورشید»(١)
بەهای «کیشمیر»و چاو جوانانی «هیند»ە
گوڵی بادامی سوخمەی شاڵی «خورشید»
سوپیهری نازە، ژێر پۆتینی باتەی
ستارەو ماهە، مێخو ناڵی «خورشید»(٢)
ئەکا دەفعی هەزار تاو لەرزو تیفۆس
کەنینێکی جنێوی تاڵی «خورشید»
شەوێ نەمدی نەکا گەردوون بە سەد چاو
تەماشای پوولەکەو دەسماڵی «خورشید»
ئەگەر رووی ماهی من ساتێ نەبینێ
ئەبێ ئاخۆ چ بێ ئەحواڵی «خورشید»

---

(١) یەلدا: تاریك، [درێژترین شەوی ساڵ].
(٢) مێخ: بزمار.

وەکـــوو لای رۆژ پـــەرستان ئـــابڕووی بـرد
بــە ئــەستۆی بـێ خـوا ئـۆباڵی «خـورشید»
دڵا، تــــاکــــەی لە گــــوڵزاری خـــەیاڵا
وەکوو شـەونم ئـەبی عـەوداڵی «خـورشید»
وەرە تـۆش وێـڵی شـەوقی شـەوڕەوی بـە
کە بەو رەش بووە چـاوی کـاڵی «خـورشید»
بـــە تـێغی رەمـــزو ئـیعجابی کـــەمەندی
مەهی شەق کردو بەستی باڵی «خـورشید»(١)
فــــیدای ئـــەو پـێشەوایــەم راخـــرابــێ
لەبــەر پـێی جـاهیا بــەرماڵی «خـورشید»
کــەسێ بــاڵی مــەلایك فــەرشی رێـی بـێ
ئــەبێ قــەدری چ بـێ، سـیپاڵی «خـورشید»
هــەموو بــۆ گــەرمیی بــازاڕی ئــەو بــوو
موغازەی چەرخـی پڕ گـۆتاڵی «خـورشید»
شوکر «بـێخود» قـیاس نـاکـرێ لەگـەڵ پـار
ســـوها لاڵانـەوەی ئـیمساڵی «خـورشید»(٢)

---

(١) بێخود لەم شیعرەوە تەعریفەکەی با ئەداتەوە بۆ سەر پێغەمبەرﷺ.

(٢) ئەم پارچە شیعرە لە ١٣٦١ی هیجریدا وتراوە کە بە حرووفی ئـەبجەد ئەکاتە «لە مەجازەوە بۆ حەقیقەتی حەقیقەتە، لە مەجازەوە بـۆ حـەقیقەتی حەقیقەتە» کە ئیشارەتە بەوە کە لە «عیشقی مەجازییەوە چووە سەر عیشقی حەقیقی».



## پیتی ڕێ

- ١ -

دەخیلت بم نەڕەنجێنی دڵی ئەولادی پێغەمبەرﷺ
لە دونیاو قیامەت خۆت نەکەی ریسوایی پێغەمبەرﷺ
«رسول الله»و عاجز کردنی ئەولادی ئەو!، هەیهات!
«معاذ الله» لە گەردی خاتری مینایی پێغەمبەرﷺ (١)
زمانت بگرە تا پاپۆڕی ئیمانت سەلامەت بێ
پەنا بە خوا لە گێژی حیددەتی دەریایی پێغەمبەرﷺ
ئەبێتە مانگی گیراو، تا ئەبەد ڕوو ڕەش ئەبێ «بالله»
بە وەر چەرخاندنی ڕووی ڕۆژی حەشر ئارایی پێغەمبەرﷺ (٢)

---

(١) هەیهات: چەند دوورە. مینا: شووشە.
(٢) حەشر ئارا: ڕازێنەرەوەی ڕۆژی حەشر.

که ئیمڕۆ «کونده بوو»ی ئەملاکو خانووی عیترەتی ئەو بێ
سبەی چۆن ئەچیە ژێر سایەی هوما ئاسایی پێغەمبەرﷺ(١)
هەتاکەی هەر خەریکی مەحوی ساداتی کە ناترسی
لە قەهری «حەیدەر»و کوورەی دڵی «زەهرا»یی پێغەمبەرﷺ
بەشارەت بێ جەهەننەم جێگەتە ئەی «باغِض»ی سادات
بە تووبای قامەتو رووی «جَنَّةُ المَأویٰ»یی پێغەمبەرﷺ
بە زاهیر بوونی، تاقی کیسڕەوی نەتدی کە چی پێ هات
قەمەر نازانی چۆن شەق بوو بە یەك ئیمایی پێغەمبەرﷺ(٢).
بە شمشێری نوعووتی خۆیو «ئال»و «سەحب»و ئەولادی
ئەبێ شەقیان بکەم تا شەق بەرن ئەعدایی پێغەمبەرﷺ
هەموو رۆژێ بە باو باپیرو خۆمو کەسمەوە سەد جار
لە سەر تا پایی من قوربانی سەر تا پایی پێغەمبەرﷺ
بجوڵێنێ سەبا تا سەروو شمشادی چەمەن «بێخود»
سەڵاوات بێ لە قەددو قامەتی رەعنایی پێغەمبەرﷺ

***

---

(١) عیترەت: نەوە.
(٢) ئەگێڕنەوە لە شەوی لەدایك بوونی پێغەمبەردا «تاقی کیسڕا» لەت بوو.
ئیما: ئیشارەتو پەنجە راکێشان.



## پیتی سین

- ١ -

شوکری خودا کە «قادر»ی موشکیل گوشایە غەوس
بۆ غونچەیی دڵی من و تۆ بای سەبایە غەوس
شوکری خودا کە مەنزەری دنیاو قیامەتە
بۆ ئێمە یەعنی جامی دوو گیتی نەمایە غەوس[1]
شوکری خودا کە بۆ دڵی پڕ چڵکی مەعسیەت
وەك سەیقەلێکی ژەنگی کەدوورەت زەدایە غەوس[2]

---

(١) مەنزەر: جێگای تەماشاکردن، وەك ئاوێنەکەی ئەسکەندەرو جامەکەی جەمشید کە ئەڵێن: یەکەمیان ئەرەستوو دروستی کردبوو بۆ ئەسکەندەرو بەسەر منارەیەکەوە لە «اسکندریّە» دانابوو وە جم‌وجووڵی دوژمنی لێوە دەر ئەکەوت، وە دووهەمیشیان هەروەها لەو چەشنە بووە.

(٢) سەیقەل: «صَیقَل»، قەڵایی ژەنگ پاك کردنەوە. کەدوورەت زەدا: ئەوەی کە لابەری رەشایی دڵو دەروونە.

مـــــاهێکی وایـــــه ســـاکـــینی بـــورجـــی ویـــلایەته
شـــاهێکی وایـــه خـــاوەنی تـــاجی رەزایـــەته غـــەوس

ئـــەولادی چـــیره دەسـتی شـــەجاعەت مـــەداره شـــەیخ
ئەحفادی خـۆشەویستی شـەفاعەت پـەنایه غـەوس[١]

یـــەك دانـــه دوڕڕەکـــەی ســـەدەفی «فـــاطمه»ی بـــەتوول
تـــاقانه ســـەروەکـــەی حـــەسەنی مـــوجتەبایه غـــەوس

مـــورغی درەخـــتی عـــالەمی ئـــەرواحـــە، دانـــەشی
فەرموویه خۆی که نووری تەجەللی خودایه غەوس[٢]

مـــیهری ســـوپیهری مـــەعریفەتەو هـــەوری رەحـــمەته
دەریایی لوتـفه، مـەنبەعی جـوودو عـەتایه غـەوس[٣]

ســـــەرداری خـــێڵی «قـــادری»و «نـــەقشەبەندی»یـــه
ئوستادی هۆزی ئەهلی تـەکـیٚو خـانەقایه غـەوس[٤]

حـــەپسی نـــەجاتی مـــەحزە، غـــەمی عـــەینی شـــادیيه
زامو بـــــرینی مـــــەڵحەمه، دەردی دەوایـــه غـــەوس

---

(١) چیره دەست: دەسەڵات دارو ئازا.
(٢) مورغ: باڵندە. دانه: دانەوێڵەی چینه.
(٣) میهر: رۆژ. سوپیهر: «سپهر»، ئاسمان.
(٤) تەکیٚ: تەکیه، بارەگای هەوادارانی تەریقەتی قادری. خانەقا: بارەگای هەوادارانی تەریقەتی نەقشبەندی.

عـــەنقایی قـــافی غـــیرەتە، بـــازی تـــەریقەتە
قـــوربییەتی ســەعادەتە، یــەعنی هــومایە غـەوس[(١)]
کـــەنناسی رێـــی مـــوریدە، مـــوریدی خـــەلیفەیە
فـــیرقەی خـــەلیفە شـــێخن‌و شـــێخی مـەلایە غـەوس
بـــڕوانـــە حـــیشمەتی کـــە لە عـــەرسەی بـــوزورگییا
ئـەسپ‌و وەزیـری مـەملەکـەتی، فـیل‌و شـایە غـەوس
قـــوتبی زەمـــان ئـــەگـــەر نـــیە ئەی مـونکیرینە بـۆچ
پـێی وا لەبـــانی شـــانی هـــەموو ئـەولیایە غـەوس[(٢)]
ئەبدال، ئەگەر ریـجال، ئـەگـەر ئـەوتاد، ئـەگـەر وەلی
بـەخوا هـەموو پـەپوولەن، ئـەوان‌و چـرایـە غـەوس[(٣)]
لەم چـــۆڵی پـــڕ لە حـــۆلی بـــیابان‌و زوڵـــمەتە
وەك «خدر»ی زیندە رابەری رێگـەی هـودایـە غـەوس
ســـەحنی مـــونیفی دائـیرەی سـێحەتی وجـــوود
قوببەی شـەریفی مـەرکەزی «دار الشّـفا»یـە غـەوس[(٤)]

---

(١) عـــەنقا: «ســیمرغ»، کـە بـاڵدارێکـی کـەمیابە. قـاف: مـەبەست کـێوی ئەفسانەیی قافە. قوربییەتی: نزیکی لێیەوە. هوما: باڵدارێکی ئێسقان خۆرە، ئەڵێن: سێبەر بەسەر هەرکەسەوە بکا ئەبێ بە پادشا.
(٢) ئەڵێن: حەزرەتی غەوس پێی بەسەر شانی هەموو ئەولیایەکەوەیە.
(٣) ئـەبدال: «اَبـدال»، تـاقمێکـن لە پیاوانـی خـوا بـە پێی ئـیستیلاحی «مُتصوّفە»؛ هەروەها «رِجالُ الغَیب»و «اَوتـاد»و «ئـەولیا». ئـەڵێن: کـاروباری گیتی بەمانە سپێرراوە.
(٤) مونیف: پان‌و بەربەرەڵڵا.

بـــۆ ئــاستانەکــەی وەرە ئـــەی تـــیرە دڵ نــــەخۆش

هەر حوجرەیێکی «رۆتکەن»ی سەدکارەبایە غـەوس (١)

دارو درەخـــــتی حـــــەسرەتی عــــوودی قــومارییە

خاشاك‌و خۆڵی رەشکــی عــەبیری خــەتایە غـەوس (٢)

بـــۆ دەســتی رەعشــە داری لە پــێ کــەوتووانــی عــەشق

یــادێکی ئـیعتیدالی قـەدی سـەد عـەسایە غـەوس (٣)

بـــۆ قـــەتڵی زەیـــبەقی هــــەوەس‌و هـــەژدەهای لەعـین

تــلیاکـــە خـــاکــی، مـەرقەدی ئـیقلیمیایە غـەوس (٤)

خۆزگەم بە خۆم کە خــاکــی نــەزەرگەی ئـەوم بـە رۆح

چـــــونکی نـــەزارەیــێکی هـــەزار کــیمیایە غـــەوس

«بــێخود» نـەکـەی خـەیاڵی تـەداوی بـە غـەیری ئـەو

لوتفێکی سەد دەوای وەکوو «عَرَق النِّسا»یە، غەوس (٥)

***

---

(١) رۆتکەن: رۆنتکەن، ئەو دەزگایەی کە وێنەی دەروونی پێ ئەگرن.

(٢) عوود: دارێکی رەشی بۆن خۆشە بۆ بۆنی خۆش ئەیسووتێنن. قومار: شارێکە لە هیندوستان کە ئەو عوودەی بە زۆری تیایە. خەتا: ناوچەیەکە لە ئاسیای ناوەڕاست، بە میشکی بۆن خۆش ناوبانگی دەرکردووە.

(٣) رەعشەدار: لەرزۆك.

(٤) زەیبەق: جیوە. ئیقلیمیا: مـاددەیەکـی کـیمیاییە جیوەی پـێ ئـەمرێ. شاعیر بۆیە لێرەدا نەفسی شوبهاندووە بە جیوە، چونکە وەك ئەو هـەردەم لەسەر بارێکە.

(٥) «عَرَقُ النِّساء»: نەخۆشییەکە.



## پیتی فێ

- ١ -

ئەی سەبا، ئەی قاسیدی ئەڕبابی ناموس‌و شەرەف
هەستە تا «کەرکووك» بچۆ ئازانە ئەمما «لاتَخَفْ»!
زوو وەکوو تەلسز بڕۆ دەستی من‌و داوێنی تۆ
وەختی خۆت نابێ بکەی یەك لەحزە زایع یا تەلەف[(١)]
ئەم عەریزەم بۆ مودیری مەنتیقەی تاپۆ بەرە
یەعنی چادر حاجی ئەحمەد زادە ئەوڕەحمان شەرەف
پێی بڵێ وەك من هەموو ئەهلی «سولەیمانی» ئەڵێن:
حافیزی ئەو بن لە کاك «ئەحمەد» هەتا شاهی «نەجەف»
تا بەراتی ئەشقیا بێ دانەوێڵەی مەعسیەت
تا خەلاتی ئەولیا بێ شاڵی تورمەی «مَنْ عَرَفَ»[(٢)]

---

(١) تەلسز: بێ تەل.
(٢) «مَنْ عَرَفَ»: ئیشارەتە بە [و حەدیسی پێغەمبەرەﷺ کە دەفەرمێ:] «مَنْ

خۆشەویستت هەر لە قەسری عوشرەتا بێ بادەنۆش
تا حەزت دایم لە بیری حەسرەتا بخوا ئەسەف
هەر بە ناوی عالەمی ویجدانەوە بەندەش ئەڵێم:
هەر بژی تاپۆ مودیری، هەر بژی «نِعْمَ الْخَلَفْ»(١)

***

---

☞

عَرَفَ نَفْسَهُ فَقَدْ عَرَفَ رَبَّهُ» واتە: هەرکەس خۆی ناسی خوایش ئەناسێ. کە ئەمەش سروشتی ئەولیای خوایە.

(١) «نِعْمَ الْخَلَفَ»: نەوەیەکی چاك. بێخود ئەم پارچە شیعرەی بۆ خوا لێ خۆش بوو «عبد الرّحمان شرف» نووسیوە.




- ١ -

«بِـحَمْدِ الله» بـه بـولبول مـەشرەبێکی «فـاضِل»و خـۆشحاڵ

عـەتای فـەرموو خـودا گـوڵ غـونچەیێکی تـازەوو لێـو ئـاڵ

ئـەگـەرچـی نـاوچەوانـی پـاکـی قـیبلەی رۆژ پـەرستانە

هیلالی عیدی «فِـطر»یش دەرئـەخا، ئـەمما بـە ئـەبرۆی کـاڵ

دەهـانو مـەقعەدی دوژمـن قـەعادەی بـێتو بـلوێری

دەمـاری حـاسیدی دەسـرازە، ئـێسقانی عـەدووی خـڕخاڵ

ئەگەر پێشکەش ئەفەرموون پێشکەشی بێت عەرشی رەحمانم

بە توولی عـومرو عـیلمو فـەزڵو جـاهو حـیشمەتو ئیقباڵ

ئـومێدم وایـە بـەد خـواهـی بـەهەشتی تـەلعەتێکی وا

بـڵێسەی دۆزەخـی بـوخلو حـەسەد بیکا بـە کـۆی زوخـاڵ

به تێغی شەرع‌و دیرعی وەرع‌و بەرزی عیلم‌و گورزی زوهد
خودا بیکەی بەسەر هاوعەسری خۆیا وەك «توهەمتەن» زاڵ(١)
کە ساڵی مەولیدیم پرسی، خیرەد فەرمووی وەکوو باوکی:
بژی «یا رَب بجاه قائل «عِش قَرناً» او صد سال»(٢)

***

- ٢ -

ئارامی جانە، مەحرەمی رازی نیهانە دڵ
یەعنی لەبەینی یارو منا تەرجومانە دڵ
عەرشی خودایە خاتری پڕ نووری موئمینان
پێی بۆیە وا لەسەر سەری حەوت ئاسمانە دڵ(٣)
وریا بە! قەت پزیسکی گوناهی تۆخون نەخەی
بۆ تائیری مەحەببەتی حەق ئاشیانە دڵ(٤)

---

(١) توهەمتەن: لەقەبی رۆستەمی زاڵە. زاڵ: باوکی رۆستەمەو بە هەرکەسێکی ئازایش ئەوترێ.
(٢) رستەی ناو دووکەوانۆلکەکە لەسەر شێوەی نووسینی جارانی کوردی، ئەکاتە ١٣٥٩ کە ساڵی لەدایك بوونی ئەوکەسەیە ئەم پارچە شیعرەی بۆ وتراوە، کە بۆمان ساغ نەبووەوە کێیە.
(٣) ئیشارەتە بە [حەدیسی]: «قَلْبُ الْمُؤْمِنِ عَرْشُ الرَّحْمٰنِ» واتە: دڵی موسوڵمان بارەگای خوایە.
(٤) تائیر: «طائِر»، باڵدار. ئاشیان: هێلانە.

دایــم له دەرکــی سینه بـه یـادی بـرۆی نـیگار
شــمشێری وا بــەدەستەوە وەك پــاسەوانـه دڵ
بــێگانه بــێته ژوورەوە قــەتعی ســەری ئـەکـا
گـــەر یــاری ئــاشنایه ئــیتر مــیهمانه دڵ
ئــاخۆ بــه یــادی نــێرگسی بــیماری کــێیه وا
روخساری سووری زەردە، بەهاری خەزانـه دڵ!
بــیماری نــازی غــەمزەیی چــاوێکی قــاتیله
مەجرووحی مەوجی جەوهەری تێغی دەبـانه دڵ
ئــاخۆ له حــەسرەتی نــەیی بــاڵایی کــێیه وا
دایــم خــەریکی نــاڵەوو ئــاه و فــوغانه دڵ!
چــەوتاوی بــاری فــیرقەتی بــاڵایی دوڵـبەره
پیرێکی بـێ عـەسایه، ئـەگـەرچـی جـەوانـه دڵ
تــێغی فــیراقـه قـەتعی رەگـی رۆحـی کـردووە
خوێن هـەروەکـوو فـواره له رۆحـی رەوانـه دڵ
یـەعنی له داخـی لالەیـی رووی دەم گـوڵێکه وا
وەك ئەشکی من کە رەنگی ئەڵێی ئەرخەوانـه دڵ
مەجنوونی گەردی ناقەیی لەیلایە، وەرنـه بـۆچ...
وەك چاوی من هەمیشه له شوێن کارەوانه دڵ(١)

---

(١) ناقە: حوشترە مێچکە.

سیمورغی قافی مەحوی خەیاڵی میانە قەلب
عەنقایی وەهمی میمی دەمی بێ نیشانە دڵ(١)
کەوتۆتە داوی تۆوە بە مەنحووسی تێنەگەی
تەیری هومایی سەعدە، نەڵێی رایەگانە دڵ(٢)
دانەی مەحەببەتی بدەرێ‌و ئاوی سافی عەشق
برسی مەیێڵە تۆ بێ‌خودا، بێ زمانە دڵ
لەوساوە شوغڵی رابیتەیی رووبی یار ئەکا
فکری ئەوەندە سافە وەك ئاوی رەوانە دڵ(٣)
بێ سوجدەیی هیلالی برۆی ئەو بەڕاستی
زەردو زەعیف‌و زارو کەچ‌و ناتەوانە دڵ
«بێخود» بە ئەمری ئەو بە لە دەیری مەجازی‌یا
ساقی مەیی حەقیقەتە، پیری موغانە دڵ
وەختی عورووجی حەققە، بەسە پەستیی بەتاڵ
بۆ بانی مەعریفەت بە خودا نەردەوانە دڵ(٤)

***

---

(١) میان: ناو قەد، وەك پیتی «قاف» لە باریکیدا. میمی دەم: دەمی وەك سەلکی پیتی «میم» لە بچکۆلەییدا.
(٢) رایەگان: مفت‌و خۆڕایی، وەك شتێك لە رێگادا دوزرابێتەوە.
(٣) رابیتە: [رابِطة]، ئەوەیە کە سۆفییەکان بیر لە خواو لە پیر ئەکەنەوە، یەکێکە لە ئادابی تەریقەتی نەقشبەندی.
(٤) عورووج: سەرکەوتن. نەردەوان: پەیژە.



# پیتی میم

- ١ -

لە کونجی خەڵوەتی غەمدا کە مەشغووڵی ریازاتم
شەوو رۆژ حەسری فیکری پەرچەم‌و رووی تۆیە ئەوقاتم(١)
بڵێسەی دۆزەخی عەشقت منی ئاوارە کرد، وەرنێ
بە خۆڕایی نیە ئەی جەننەتی عیرفانی تۆ لاتم(٢)
ئەگەر بۆ خزمەتت کاغەز نەنووسم چاوەکەم، حەقمە
لەبەر بێ چاوییە، دوور بێ لە تۆ، گەر بێ موبالاتم
ئەگەر بێ باوەڕی بڕوانە ئاوێنەی دڵی خۆشت
کە قوربانی دڵی ئاوێنەوو حوسنی تەماشاتم
لە دیوانی چەمەنزاری مەحەببەت هەروەکوو قومری
بەڵا گەردانی سەروی میسرەعی مەوزوونی باڵاتم

---

(١) ریازات: [ریاضات]، ئازاردانی نەفس لەسەر شێوەی سۆفییەکان.
(٢) ئەی جەننەتی عیرفانی تۆ: ئەی کەسێك کە تۆ بەهەشتی زانستی...!

لەبـــۆ مـیحرابـی ئـەبرۆی تـۆیە گـەر مـەجبووری مـزگەوتم
لە نـــەشئەی چـــاوی مـــەستی تـۆیە مـەفتوونی خـەرابـاتم
ئەگەر «فیل»م لەبەر دەست «ئەسپ»ی تۆدا، فەرزە بەیدەق بم
وەگەر شاهم لە عـەرسەی عـەشقی تـۆدا بـێ روخت مـاتم
لە بـەزمی حـوسنی خـۆتا تـۆ خـودا جـار جـارە یـادم کـە
کە من پەروانەکەی روخسـاری شـەمعی مـەجلیس ئـاراتـم
بە «شێخ نووری» بفەرموو چاوەکانت مـاچ ئـەکـا «بـێخود»
بــە یــادی خـانەیی خـەمماری ئـەو مـەستانە وا هـاتم[1]

***

- ٢ -

عـــــومرێکە ســــیەه رۆژو پــــەرێشانی کــــوەیتم
ئـــاشوفتە وەکـــوو تـــورڕەیی خـــووبانی کـوەیتم[2]
عـــومرێکە کـــە رۆژم بـــە مـەسەل وەك شـەوە زەنگـە
حـــــەسرەت زەدەیـــی شـــامی غـــەریبانی کـــوەیتم
عـــومرێکە لە زیـندانـی جـونوونا کـە وەکـوو شـێت
پـــا بـــەندی غـــەزاڵانـــی ئـەسیرانـی کـــوەیتم

---

(١) شێخ نووری: نووری شێخ ساڵح. بێخود ئەم پارچە شیعرەی بۆ «عەلی باپیر ئاغا» نووسیوە.
(٢) عـومرێکـە: زەمـانێکـە. ئـاشوفتە: تـێکـچوو. تـورڕە: [طـرّە]، زوڵف. کوەیت: [کُوَیْت]، وڵاتی کوەیت.

عــــومرێکه له کـــونجی قـــەفەزی فـــیرقەتی گـــوڵدا
وەك بـــوڵبوڵی دڵ خـــەسته غـەزەل خـوانـی کـوەیتم
عومرێکه له دووری مەحمەلی لەیلا وەکوو مەجنوون
خـــــۆم لێـــــرەوو دڵ وێـــڵی بـــیابانی کـــوەیتم[١]
عـــومرێکه لەبـــۆ کـــوشتنی دەجـــجاڵی حـەسوودان
هــــــەر مــــونتەزیری عـــیسەیی دەورانـــی کـــوەیتم
عـــومرێکه دەنـــاڵم بـــە غـــەمی تـــۆوە له کـەرکووك
دایــم وەکـــوو نـــەی سـینه پـــڕ ئـــەفغانی کـوەیتم
پـــــێویسته وەکـــــوو قـــومریی ئـــاوارە له گـــوڵشەن
ســـەر گـــەشته دڵـــی ســـەروی خـــەرامـانی کـوەیتم
پەروانه سـیفەت «مُـضطَرِب»م کـوللی شـەو، ئـاخۆ...
کەی پورتەو ئـەدا شـەمعی شـەبوستانی کـوەیتم؟[٢]
کـــەی بـێ کـە له ئـوفقی «عــەرەبوستان»ەوە رۆژێ...
هــەڵبێ گـــوڵی خـــورشیدی درەخشـــانی کـــوەیتم؟
وا تـــێمەگـــە دوورم له تـــۆ ئـــەی ســاحێبی خـاتەم
هەر «هود هود»ەکەی بەزمی «سولەیمان»ی کوەیتم[٣]
خـــەڵکینه لەبـــەر گـــەوهەری تـاجی سـەری کـوردە
قـــــوربانی مـــــوحیتی عـــــەرەبوستانی کـــــوەیتم

(١) مەحمەل: کەژاوە.
(٢) پورتەو: تیشك.
(٣) هود هود: پەپوو سلێمانە.

هـــەرچـــەندە لە زیـنـدانـی فـیراقـام وەکـوو «بـیژەن»
بـــیللا بـە تـەمای «رۆسـتەم»ی داسـتانی کـوەیتم[(١)]

عاجز مەبە «بێخود» کە ئیشەڵڵا وەکـوو «یـەعقووب»
نـــەزدیکە ویســـاڵی مـــەهی «کـەنعان»ی کـوەیتم[(٢)]

***

- ٣ -

«بِـــحَمْدِ الله» دڵــی دەریـــایە «خـــادم»
خـەیاڵی گـەوهەری یـەکتایە «خـادم»[(٣)]

لە دوڕجی نـەزم و نـەسری لەفـزی ئـەودا
مـــــەعانی «لُـــؤلُؤ»ی لالایــە «خـــادم»

---

(١) بیژەن: کوڕی «گیو»و خوشکەزای «رۆستەم» بووە، دڵی ئەچێ لە «مەنیژە»ی کچی «ئەفراسیاب». جارێکیان ئەفراسیاب لە ماڵی کچەکەیا ئەیبینێ، ئەیگرێ و لە چاڵێکدا بەندی ئەکا، پاشان رۆستەمی خاڵی دێت رزگاری ئەکا. بیللا: قەسەم بە خوا.

(٢) بێخود ئەم پارچە شیعرەی بەبۆنەی گەڕانەوەی خوا لێ خۆش بوو شێخ «مەحموود»ی «حەفید»ەوە وتووە لە «هیندوستان»ەوە، لەو کاتەدا کە گەیشتووەتە «کوەیت». ئەم پارچەیە لە ژمارە "٦"ی رۆژنامەی «بانگی کـــوردستان»دا بـــڵاو کـراوەتـەوە کـە لە ١٩٢٢/٩/١٨ی رێکـەوتی ١٣٤١/١/٢٦دا دەرچووە.

(٣) خادم: «خادم السّجادە»ی کەرکووك.

لە عـــەرسەی شـــاترنجی ئـیعتیقادا
لەسەر ئەسپی سەداقەت شایە «خـادم»[(١)]
لە لوجـــنەی ئینتیخابی حـوسنی خـولْقا
وەکوو نـائیب رەئیس ئـەعزایـە «خـادم»
لە ســـایەی وەســفی بـاڵا نـــەونەمامان
کـــەلامی تـــا بـلێی بـاڵایە «خـادم»
عـــەزیزان بــۆ قـوماشی یـوسفی عـیشق
خـــریدارێکـــی بـــێ پـــەروایە «خـادم»
لە دیـوانـــی بـــەهەشتی قـــەت مـەپرسن
کە یەك میسراعی سەد تووبایە «خادم»[(٢)]
لە خـومخانەی دوکـانا وەخـتی نـووسین
سـیاهی مـــەی قـــوتوو مـینایە «خـادم»
ئەگەر «مەهدی» لە عـەسری «نـادر»ا بـوو
بەڵێ لەم عەسرەشا «میرزا»یـە «خـادم»[(٣)]
بە «خێ» خێی خەتتی مەشقی «إبن مُـقلە»
بە «ئەلف» ئەلفی هەزار ئیملایە «خادم»[(٤)]

---

(١) شاترنج: شەترەنج.
(٢) تووبا: «شَجَرَة الطوبیٰ»، درەختێکە لە بەهەشتدا.
(٣) مەهدی: میرزا مەهدی خانی باشکاتبی نادر شای هەوشار.
(٤) إبن مُـقلە: خـۆش نـووسێکـی بـەناوبانگ بـووە. بێخـود لەم شـیعرەو شیعری دوواییدا یەکە یەکەی وشەکانی «خادم» لێك ئەداتەوە.

نەوەك هەر «دال»ی دالی دیققەتەو بەس

«چل»یشی میمی سەد مەعنایە «خادم»(١)

مەڵێ «کۆیی» نەژادەو بەس بفەرموو

کە خەڵقی «جَنّتُ المَأویٰ»یە «خادم»

لەلای من بۆ تەواوی دڵ نەخۆشان

مەقامی عەینی موستەشفایە «خادم»

بە نووری شەمسی دین گەر مونعەکیس بوو

لە سایەی شیعری مەولانایە «خادم»

چە مەولانا «جلال الدّین»ی رۆمی

کە رۆژی مەحزە ئەو حیربایە «خادم»(٢)

لە عیلمی باخەوانی مەسنەویدا

ریازی مەعنەوی ئارایە «خادم»

لە زەهری ماری غەیبەت چۆن ئەترسێ

کە تریاکی حوزووری لایە «خادم»

خودا حەزکا لەگەڵ جیرانی پاکی

لە زومرەی پیرزی «اَهلُ الله»یە «خادم»

---

(١) چل: بە حورووفی ئەبجەد بەرابەری وشەی «میم»ە.

(٢) «جلال الدّین»ی رۆمی: سۆفیو زاناو شاعیری بەناوبانگ خاوەنی «مەسنەوی». حیرپا: رۆژگار پەرست.

دەوامی بێ بە قەد عومری کوڕی خۆی
هەتا شیعری لە دنیا دایە «خادم»[١]

***

- ٤ -

وەك خاڵی گۆنە هێندە خەتابارو روو رەشم
وەك پەرچەمی بە شانە نەکردوو، موشەووەشم[٢]
گەه سینە چاکی غەمزەیی خووبانی بێ وەفام
گاهێ کەتانی پوڕتەوی روخساری مەهوەشم[٣]

---

(١) کوڕ: مەبەست لە شیعرە. ئیشارەتە بە شیعرێکی فارسی کە ئەڵێت:
مرگ فرزند نديد آنكه سخن زادەی او است
کاشکی عُمر پدر صد يك اولاد بُدی
واتە: ئەوەی نووسراوی لەپاش بەجێ بمێنێ مەرگی مناڵی خۆی نابینێ، چونکە مناڵەکەی نووسراوەکەیەتی، وە نووسراویش نافەوتێ. خۆزگە عومری باوك سەد یەکی عومری مناڵەکەی ئەبوو کە نووسراوەکەیەتی.
بێخود مێژووی دانانی ئەم پارچە شیعرەی بە حورووفی ئەبجەد بەم جۆرە نووسیوە: «لەلایەنی بێخودەوە بۆ دۆستێکی دینی» کە ئەکاتە ١٣٧١ی هیجری. ئەو دۆستەش «علی رفیق خادم السّجادە» بووە لە کەرکووك.
(٢) گۆنە: گۆنا. پەرچەم: زوڵف.
(٣) سینە چاك: سینە لەت لەت بوو. کەتان: جۆرە قوماشێکە، ئەڵێن ئەگەر تیشکی مانگ لێی بدا دائەفرەقێ. مەهوەش: جوان.

وا ساردو گەرمی زوهدو گوناهم کە تێئەگەم
مەحرוومی ئاوی «کەوسەر»و مەحکوومی ئاتەشم(١)

من چۆن نما ئەکەم کە وەکوو گێسکەکەی «هەیاس»
هاوشانی گورگی دێوو سەگی نەفسی سەرکەشم(٢)

ئەی ناخودایی بەحری کەرەم وەختی رەحمە پێم
کەشتی هەموو شکاوم‌و دەریا لە باوەشم(٣)

من سائیلی شەفاعەت‌و تۆ ساحێبی مەقام
لەو خوانی نیعمەتەت بدە سا لوقمەیێ بەشم

من دەردەداری دەردی «مَعاصی»م‌و تۆ تەبیب
دەردم دەوا کە تۆ بی خودا داوەشا لەشم

تا شاد نەبم بە مەرحەمەتی کیمیایی تۆ
بوونی بە «زەڕ» مەحاڵە «مس»ی قەڵبی، پڕ غەشم

---

(١) واتە: بۆیە لە خوا پەرستیدا ساردم، چونکە بێ بەشم لە ئاوی «کَوثر» تا فێنکم بکاتەوە، وە بۆیە لە گوناهدا گەرمم، چونکە حوکم دراوم بە چوونە ناو ئاگری دۆزەخ.
(٢) نما: پێ گەیشتن‌و باڵا کردن. گێسکەکەی هەیاس: لە مەسەلەی کوردیدا هەیە کەوا هەیاس ناوێك گێسکێکی بووە هەموو رۆژێ خواردنێکی باشی داوەتێ‌و قەڵەوی کردووە، ئەوجا هاتووە گورگێکی پیشان داوە، گێسکەش لە ترسانا هەرچی گۆشتی ناوە بە یەکەوە هەمووی تواوەتەوە...ئیتر بەم جۆرە هەرگیز نەیهێشتوە لە رادەیێکی تایبەتی زیاتر گەورە بێ... سەرکەش: یاخی. (٣) ناخودا: کەشتیەوان.

هەرچەند ئەکەم خەیاڵی نەسیمی شەفاعەتت
وەك غونچەیی کراوە سەراپا وەها گەشم
شایی تکایی تۆیە، منیش بۆیە وا بە شەوق
سازندەییێکی شایەرو عەبدێکی چاوەشم(١)
«بێخود» بە کردەوەو قسە، خاکم بەسەر، وەهام
هەروەك دەمو جنێوی بتان نیشمو هەشم(٢)

***

- ٥ -

ئەیا رەفیقی شەفیقم، حەریمی رازی نیهانم
ئەدیبی فیکری حەقیقیم، نەدیمی رۆحی رەوانم(٣)
ئەگەر لە حاڵم ئەپرسی، بە سەنگی سورمەیی دووری
شکاوە شووشەیی وەسڵم، نەماوە نوتقی زمانم(٤)

---

(١) سازندە: زۆر بلێ، مەبەست گۆرانی بێژە. شایەر: شاعێر: گۆرانی بێژ. چاوەش: دەهۆڵو زوڕنا ژەنی شایی.
(٢) بتان: جوانان. واتە: قسەم هەیەو کردەوەم نیە، هەروەك جوانان چۆن دەمیان نیەو جنێویان هەیە. مەبەست لە نەبوونی دەم ئەوەتە دەمی جوانان ئەوەندە بچووکە وەك نەبوو وایە.
(٣) حەریم: مەحرەم. نەدیم: هاودەنگ.
(٤) سەنگی سورمە: بەردی کلەی چاو رشتن. مەبەستی ئەوەیە ئەم بەردی کلەی دوورییە بەو پێیە کە بەردە شووشەی وەسڵی شکاندووم، وە بەو پێیە کە کلەیە توانای قسەکردنی نەهێشتووم، چونکە هەرکەس کلە بخوا زمانی نامێنێ.

که ئەچمە حوجرە ئەڵێی دەشتی «شارەزوور»ە بەبێ تۆ
ولاخ ئەخاتە مەلە ئاوی «زەڵم»ی ئەشکی رەوانم
بە شەو پەپوولە سیفەت خول ئەخۆم بە دەوری چرادا
کە رۆژ هەڵات ئیکە خورشید پەرستی بورجی دوکانم(۱)
ئەوەندە مەحوی غەمم ئەی عەزیزی میسری بەلاغەت!
دەهانی یۆسفی سانی سیفەت، نەماوە نیشانم(۲)
وەری گەڵای تەڕەبی باغی دڵ بە پایزی ئەندۆه
درەنگە بێرەوە پیر بوو بەهاری عومری جوانم
بەجێ نەمێنی لە کەرکوک، نەبیتە باعیسی خوێنم
ئەگەر نەیەیتەوە «لەوسەر»، ئەبیتە قاتیلی جانم(۳)
وەکیل بە تۆ کە سەلامی منت گەیاند بە فەقێکان
لەپاش موسافەحە عەرزیان بکە کە بەندە فلانم

---

(۱) واتە: وەك چۆن گوڵی «رۆژگار پەرست» بەسەر بورجی دووکانەوە لەگەڵ خۆرا ئەگەڕێ، منیش هەرچەند کە رۆژ ئەبێتەوە ئەچمە سەر بەرزیو چاو بەملاو لادا ئەگێڕم بە هیوای دیتنی تۆ کە بێیتەوە.
(۲) دەهان: دەم. ئەڵێن حەزرەتی یۆسف ﷺ لە ساڵە گرانییەکانی «مِصر»دا بە قسەی خۆش توانیویە متمانە بخاتە دڵی خەڵکەوە.
(۳) لەوسەر: بە ئملای کۆنی کوردی «لوسر»، لەو سەرەوە بیخوێنیتەوە وشەی «رسول»ی لێ دەرئەچێ، دیارە بێخود ئەم شیعرەی بۆ «رسول» ناوێك نووسیوە.

بفەرموو «بێخود»ی شیرین کەلام ئەڵێ بە هەمووتان...
ئەگەرچی خوسرەوی شیعرم، بەڵام غولامی ئەوانم(١)

***

- ٦ -

بە دەشتی پڕ جنوونی ئاخەوە مەجنوونی شەیدا خۆم
بە شاخی «بێستوون»ی داخەوە فەرهادی ریسوا خۆم(٢)
لە بازاڕی دڵا سووتا هەموو سەرمایەیی خۆشیم
لە یانەی دەست و پێ بەسراوییا بێ سوودو سەودا خۆم(٣)
لە حەو خوانی تەلیسمی سەخڵەتی و زیندانی ماتەمدا
گەهێ کاووسی بێ تاوان و گاهێ بیژەن ئاسا خۆم(٤)
منم هەردوو دەسم لێ بوونە تێغی تیژی سەرهەنگان
بەدەس ئەسکەندەری گەردوونەوە بێچارە دارا خۆم(٥)

(١) بێخود خۆی لەسەر ئەم شیعرانەی نووسیوە: ماویەتی، بەڵام ون بووە لێم.
(٢) بێستوون: ئەو شاخەیە کە «فەرهاد» بە واتەی «شیرین»ی «ئەرمەن» دای تاشی و نەخشی لێ هەڵکەند، ئەکەوێتە ناوچەی کرماشانەوە لە کوردستانی ئێران.
(٣) یانە: ماڵ، خانوو.
(٤) حەو خوان: «هفت خوان». لە بەشی یەکەمی پیتی «ئەلف»دا باسمان لێ کرد.
(٥) دارا: دوا پادشای «هەخامەنشی» کە لە شەڕەکەی هەولێرا لەسەر دەستی ئەسکەندەری مەکدۆنیەدا شکستی خوارد.

لەبــەر بــای پــێچەوانــەی غـەم لە هـیچلا نـاگـرم وەقـرە
لە عەردی وشکی دووری جـاویدانـا مـەوجی دەریـا خـۆم
لە ســـاحەی پـــڕ لە تـــۆزو گـــێژەڵووکەی دڵ شکســـتیدا
بــەدەم بــای ئــاهەوە هــاوشانی دڕكو داڵــی سـارا خـۆم
ســـەرو شـانی دڵـم پڕ بـوو لە تـاجو شـیرو روتـبەی غـەم
لە مشکــۆی پــایەختی نــامورادیــدا شـەهەنشا خـۆم[1]
گەهێ سەرگەشتەیی «مەلحە»و «قەراج»و «نەینەوا»و «پیر مەم»
گەهێ ئاوارەیی «هەولێر»و رێی «کەرکووك»و «بەغدا» خۆم[2]
لە کــەنعانی فـیراقو جـان گـودازیـدا وەکـوو «یـەعقووب»
لە «مـیسر»ی ئیشتیاقو عـیشقبازیدا «زوڵـەیخا» خـۆم[3]
هیلاکـی بـازەکـەی ئـەوجی «عـەبابەیلێ»ی وەکـوو بـەغدا
پەشێوی شاهەکەی «ئەحمەد بـڕندە»ی وەك «بـوخارا» خـۆم
گەهێ دڵ چاکی تێغی زیهنی شێخ «عـبد الکـریم»، گـاهێ...
جگەر چاو پـڕ لە ئـاوی رۆژی عـیلمی کـاکـە «بـابا» خـۆم
هـــەڵەستم، دائـــەنیشم وێـــنەیانم هــەر لەبــەر چـاوە
مــوریدێكو خـــەریکی رابـیتەی دوو پـیری دانــا خـــۆم

---

(١) مشکۆ: لە وشەی «مەشکۆیە»ی فارسییەوە وەرگیراوە، واتە: کۆشكو سەرا.
(٢) ناوەکانی دێری یەکەم ناوی چەند شوێنی لیواکانی کوردستانی عێراقن.
(٣) جان گوداز: گیان تواندنەوە، بەخت کردن. زوڵەیخا: ژنەکەی عەزیزی میسر کە دڵی چوو بوو لە حەزرەتی یۆسف عليه السلام.

بــەهەشتی نــیشتمانم بــێ ئــەوان لا ئــاگــری ســووره
لە شــادی گــیتی‌یا دۆزەخ نشــینی شــینی عــوقبا خــۆم
لە هــیچلا بــێ بــەها نــابێ ســەدەف پــەروەردەیی ئــیخلاس
لە بــەحری بــێ پــەیی میهرو وەفــادا دوڕڕی یــەکتا خــۆم
بە دەم دەنووکی چەرخی چنگ بە خوێنی دەردەوە «بــێخود»
لە چــۆڵی گــەرمیانی بــێ نــەوایــیدا حــوبارا خــۆم(١)

***

- ٧ -

دیــــدەکــــەم لەو رۆژەوە مــــن ئــاشناتم، رۆحــەکــەم
ئــــاشنایێکی بــــە گــیانو دڵ فــیداتــم، رۆحــەکــەم
پــوڕتەوی رووی تــۆم کــە دی لەو ســاوە وەك «روحُ البَــیان»
هەر خەریکی سەیری سوورەی «والضُّحیٰ»تم، رۆحەکەم(٢)

---

(١) حوبارا: کەڕەواڵە. ئەڵێن بەیانی کە هێلانەکەی خۆی بەجێ ئەهێڵێ ئێوارە رێ ناباتەوە سەری. ئەم پارچەیە لە لاواندنەوەی خوا لێ خۆش بووان شێخ «عبدالکریم»ی ئەحمەد برندەو شێخ «بابا رەسول»ی عەبابەیلیدا وتراوە کە یەکەمیان لە ١٣٦١ و دووهەمیان لە ١٣٦٣ی هیجریدا کۆچی دواییان کردووە.
(٢) «روح البیان»: تەفسیرێکی قورئانە کە زانای تورك «ئیسماعیل حقی» دایناوە. «والضُّحیٰ»: یەکێکە لە سوورەتەکانی جزمی «عَمَّ».

تـــا لە چـــاوی مـــوڕشیدی تـــۆ بـــەیعەتم وەرگـــرتووە
رۆژو شـەو مـەجزووبی حـەوشی خـانەقاتم رۆحـەکـەم[١]

دڵ ئـەگـەر مـەفتوونی دانـەی خـاڵەکـەی سـەرگۆنەتە
خـۆم ئـەسیری پـەرچـەمی داوی بـاڵاتم رۆحـەکـەم

تۆ کە لۆرتی حوسنی ئەمڕۆ، فـەرزە مـن بـێ بـەش نـەکـەی
مـوستەحەققی رووت‌و مـوحتاجی زەکـاتم، رۆحـەکـەم

مـن بـە قـووتی وەسـڵی ئـێوارەو سـبەینێی تـۆ ئـەژیم
تـۆ خـودا تـۆش نـەی‌بڕی مـووچەو بـەراتـم، رۆحـەکـەم

شەو ئەزانـی بـۆچی هـەر دەورو خـولی رووی تـۆ ئـەدەم!؟
تـا بـزانـی مـن کـە پـەروانـەی چـراتـم، رۆحـەکـەم

بشمرم خاکم لەپاش سەد ساڵ ئەڵێ وەك «سـام»ی «نـووح»
ئـەی مـەسیحا چـاوەڕێی یـەك مـەرحـەباتم رۆحـەکـەم[٢]

تـووشی تـێغی نـازی تـۆ بـووم تـازە تـوخوا لێم گـەڕێ
بـا شـەهادەت بـێ بـە ئـەسبابی نـەجاتم، رۆحـەکـەم[٣]

---

(١) مەجزووب: [مَجْذُوب]، راکێشراو. سۆفی لە سۆزی بیر کردنەوەدا لە خواو لە پیر حاڵەتێکی تایبەتی بەسەرا دێ کە بەو حاڵەتە ئەوترێ جەزبە، «جَذبة».

(٢) ئـەفسانەیەك هـەیە ئـەڵێ: حـەزرەتی «عـیسا»عليه السلام سـامی کوڕی حەزرەتی «نووح»ی عليه السلام زیندووکردووەتەوە!.

(٣) شەهادەت: شەهید بوون. «شەهید» لەو دنیا لێ پرسینەوەی نیە!.

جـائیزەی ئـەم شیعرە نـازدارانـە «بـێخود» عـەرز ئـەکـا...
کـافیە بـەم نـەوعە لوتـفت بـۆ خـەڵاتم، رۆحـەکـەم

***

- ٨ -

## پێنج خشتەکی «بێخود» لەسەر هۆنراوەی «زێوەر»

موشکی خوتەنە پەرچەمی خۆشبۆی برایم
رەشکی سەمەنە روومەتی مینۆی برایم
لەعلی یەمەنە لێوی سوخەنگۆی برایم
«دورڕی عەدەنە تەلعەتی نیکۆیی برایم
سەروی چەمەنە قامەتی دلجۆیی برایم»(١)

زاهید نە، منی عاشق ئەسیرم بە نیگاهی
مورشید وەرەگێڕێ لە ئیمان چاوی سیاهی
کاری من و «مانی» نیە قەت سوورەتی ماهی
«نەخشینە بە نووکی قەڵەمی سونعی ئیلاهی
دنیا ئەگرێ قووەتی بازوویی برایم»(٢)

---

(١) خوتەن: ناوچەیەکە لە ئاسیای ناوەڕاست. رەشك: مایەی خەفەت. سەمەن: سێ‌پەڕە. مینۆ: ئاوێنە، ئاودار، رەنگاو رەنگ. نیکۆ: چاك. دلجۆ: ئەوەی دڵ بە دوایا ئەگەڕێ. (٢) ماهی: وەك مانگی نەو.

لەوساوە کە بیماری ئەوم دیوە بە دووربین
خەڵکینە مەپرسن لە منی خەستەوو میسکین
هەرچەندە دڵم چاکە بە تیری «بلە نەخشین»
«فیکرم هەموو رەنگینە لە فەیزی دڵی خوونین
ئەی من بە فیدای خەنجەری ئەبرۆیی برایم»(١)

ئەو شۆخە کە چەفیەی لە سەرو گەردنی ئاڵان
ریشەی دڵی عوششاقی بە ریشووی رەشی پچڕان
کوڵمی کە بەدەر خستو جیهانی هەموو شێوان
«ئەستێرەیی روخساری دڵی عالەمی سووتان
بورهانی مونەججیم بوو مەگەر روویی برایم»(٢)

وەك مورغی قەفەس بۆچی نەکەم زارو نەفیرێ
حەیرانم ئەمیستاکە وەکوو بمخەنە بیرێ
نەم بیستووە قەت راوکەر هەتا ئێستە بگیرێ
«بیستوومە بە داموو بە شکار ئاسك ئەگیرێ
ئینسان ئەگرێ دیدەیی ئاهوویی برایم»(٣)

گەرچی منی دێوانە بە دڵ ماتو حەزینم
لەم بادیە سەییاد سیفەت گۆشە نشینم

---

(١) دووربین: دیتن لە دوورەوە. چاکە: لەت لەتە.
(٢) چەفیە: چەتفە. بورهان: بەڵگە. مونەججیم: نجووم گەر، [ئەستێرەناس].
(٣) نەفیر: هاوار. دام: داو.

بۆ گرتنی ئەو ئاسکە دایم لە کەمینم
«ئەو نیعمەتە پڕ لەززەتە رۆژێ کە ببینم
دەستی من لەسەر گەردەنو ئەبرۆیی برایم»(١)

ئەو رۆژە کەوا دای لە دڵم تیری موحەببەت
گرتی بە مەسەل ئایینە تەسویری موحەببەت
چونکە بووە دێوانە بە زەنجیری موحەببەت
«بەدبەختییە ئازادی لە زەنجیری موحەببەت
بەم رەنگەیە تای سیلسیلەیی موویی برایم»(٢)

ئەو رۆژە کە ئەو رەهزەنە پشتی لە وەفا بوو
کاروانی دڵو دینو ئیمان رووی لە فەنا بوو
قوربان وەکوو «بێخود» مەبە دوچاری بەڵا بوو
««زێوەر» بە حەزەر بە ئەمە ئاشووبە بەڵا بوو
ئیمان ئەدزێ قووەتی بازوویی برایم»(٣)

***

---

(١) بادیە: دەشت.
(٢) بە مەسەل: هەروەك. تا: تاڵ. واتە: وەك چۆن وێنەگر لە بەردەمی ئینسانا ئەوەستێ وێنە ئەگرێ، ئەویش لە بەردەمی منا وەستاو تیرێکی پێوە نام، وە بەو تیر پێوە نانە وێنەیەکی جوانی خۆشەویستی گرت.
(٣) رەهزەن: رێگر.



# پیتی نوون

- ١ -

گەر هود هودەکەی بادی سەبا بێ لە «سەبا»تان
گەر تەختی «سولەیمان»یە ئەیخاتە هەواتان(١)

---

(١) هود هود: پەپوو سلێمانە. سەبا: پاتەختی بەلْقیس شا ژنی یەمەن لە سەردەمی حیمیەرییەکانا. لە قورئانا هەیەکە پەپوو سلێمانە یەکێك بووە لەو باڵدارو جانەوەرانەی خوا رامی کردبوون بۆ حەزرەتی سولەیمان علیه السلام ئیشیان پێ بکا؛ وە جارێکیان ئەم پەپوو سلێمانەیە دەنگو باسی شاری «سەبا»ی هێنا بۆ حەزرەتی سولەیمانو ئاخرەکەی ئەو مەسەلە بوو بەهۆی ئەوە حەزرەتی سولەیمان علیه السلام دەس بگرێ بەسەر وڵاتی یەمەندا؛ وە وەك لە مێژوودا هەیە «بەلْقیس»ی شا ژنی سەبایشی مارە کرد...

جا بێخود لەم شیعرەدا ئەڵێ: بە پێچەوانەی حیکایەتەکەی حەزرەتی سولەیمانەوە، ئەگەر بای بەیانی رێی بکەوێتە بارەگای یار، تەختی سولەیمانیش ئەخاتە سەر سەودای خۆشەویستی ئەوو ئەیفڕێنێ بۆلای؛ یا خود ئەیدا بەدەم بای خۆشەویستی ئەوەوە.

دوێـنێ نــەفەسم بـوو بـە عـەتتار خـانەیی چـینی
هــێنای کــە سـەبا نـامەیی مـوشکینی وەفـاتان(١)

لەم گــوڵشەنە گــەر حــاڵی دڵو ڕۆحــم ئـەپرسن
ئەی مورغی زمانم شەوو ڕۆژ نـەغمە سـوراتـان(٢)

دڵ ڕۆیـــیوە، بــیستوومە ئــەڵێن وا لە «مــەدینە»
ڕۆح مــاوە کــە بــیکەم بـە فـیداتـان بـە فـیداتـان

چــاوم کـە لەلام گـۆزەیە، ئـەشکم بـە مـەسەل ئـاو
خۆیشم کە لەلای ئێوەم ئـەوا بـووم بـە سـەقاتان(٣)

سەد شوکری خودا چاکەوە بوو خەستەکەی ئێمەیش
ئــەی دافــیعی تــیفۆسی دەروون تـۆزێ دۆعـاتان

«بــێخود» کــە هـەتیوی دەری ئـەولادی ڕەسـوولە
نــازدارە، فــەرامــۆشی مـەکـەن تـۆ بـی‌خوداتـان

***

- ٢ -

بــە خــوڕ دیســـان ڕژا فـرمێسکی بـاران
لە هەوری چاوی سووری دوڕ نیساران(٤)

---

(١) نەفەس: هەناسە. عـەتتارخـانەی چـینی: دووکـانی فـرۆشـتنی هـەموو جۆرە کەرەستەیێکی بۆن خۆش کردن.
(٢) نەغمە سورا: ئاوازە خوان. (٣) ئەشك: فرمێسك. سەقا: ئاو دێر.
(٤) دوڕ نیسار، «نِثار»: بڵاو کەرەوەی مرواری.

تــەمی مــاتەم ولاّتــی کــوردی داگــرت
لە پــڕ وەك دووکــەڵی مــاکــینە، شــاران[١]
زەمــین بــۆ قــوڕ نــەپێوێ وەك مــن و تــۆ
زەمــان بــۆچی نــەشێوێ چــەشنی جــاران
جەنابی «حەپسە خــان» تــەشریفی رۆیــی
شکـــا پشـــتی فـــەقیران و هــەژاران
ژن، ئەمما «فی الحقیقة» خــادیمەی قــەوم
کە یەعنی سەییدەی غــیرەت شکــاران[٢]
رەئـــیسەو خـــانەدان زادەی ســـەیادەت
ئـــەمیرو شـــای ژنـــانی بـــەختیاران
تـــەبیبەی دەردی بـــیمارانـــی بـــرسی
کـــەرەم بـــەخشی بـــرینی دڵ فگـــاران
مشـــوور خـــۆری گـــرۆهی ئـــادەمیزاد
لە مـــنداڵ تـــا ئـــە گـــاتە دەس بـــەداران
لە کـــوورەی ئـــاگـــری غـــەمدا مـــەپرسن
لە ســـۆزی ئـــاهو نـــاڵەی بـــێ قـــەراران

---

(١) واتە: وەك چۆن دووکەڵی مەکینە شاران دائەگرێ، بەو جۆرە...
(٢) غیرەت شکار: ئەو کەسەی ئەوەندە بەغیرەت بێ وەك راوی غیرەتی کردبێ و کردبێتی بە دیلی خۆی...

ئەشێ حەسرەت نوشینی شینی ئەو بن
مەلاو شێخو گەدا تا تاجداران[١]
فیداکاری غەریبو خۆ ولاتی
وەفا داری لەبارو نالەباران
بە خۆڕایی لەبەر پێیا نەکەوتوون
لە پیریژن هەتا سیمین عوزاران
کە گوڵ رۆیی لە باخا بۆ نەناڵن
هەتا مردن هەزاران وەك هوزاران[٢]
بە میلادی، وەفاتی، گەر ئەپرسن
«دریغ بۆ حەپسە خان» تەئریخە، یاران[٣]
ئەگەرهیجریش ئەڵێن«ئەوبوومشوورخۆر»
بە جیددی بۆ زەلیلو لەش بەباران
ئەتۆش «بێخود» بڵێ دایم رووەو بەیت
بە هاوینو بە زستانو بەهاران
خودا جێگەی بەهەشتی جاویدان کەی
بە جاهی جەددی خۆیو ئالو یاران[٤]

---

(١) ئەشێ: شایانەو دەس ئەداو بەجێیە.
(٢) هەزاران: هەزار کەس. هوزاران: بولبولەکان.
(٣) [ئەوانەی وان لەناو دوو کەوانۆکەکاندا، لەم هۆنراوەو هۆنراوەی دوایی] بەپێی حورووفی ئەبجەد.
(٤) ئەم پارچە شیعرە بەبۆنەی وەفاتی «حەپسە خانی نەقیب»ەوە وتراوە کە لە ١٣٧٢ی هیجریو ١٩٥٣ی میلادیدا کۆچی دوایی کردووە.

- ٣ -

لەو رۆژەوە رۆیشتووە تۆراوە دڵی من
هەرچەند ئەگەڕێم بێ سەرو شوێن ماوە دڵی من
ئاخۆ بە چ شاخێکەوە گیرساوە دڵی من
یا خۆ بە چ داخێکەوە سووتاوە دڵی من

ئەو هەمدەمی غەمخوارو نەدیمی منە یا رەب
ئەو مەحرەمی ئەسرارو قەدیمی منە یا رەب
ئەو گەوهەری شەهوارو یەتیمی منە یا رەب
کەوتۆتە چ بەحرێکەوە، خنکاوە دڵی من(١)

مەجنوونی دوو گیسوویی چ لەیلاییێکە ئاخۆ
یا وامیقی جادوویی چ عەزراییێکە ئاخۆ
دێوانەیی ئاهوویی چ سەحراییێکە ئاخۆ
کام چیهرە پەری دیوە کە ترساوە دڵی من(٢)

ئەتلێتەوە گاهێ بە خەیاڵی خەت و خاڵی
ئەخولێتەوە گاهێ بە چرای شەوقی جەماڵی

---

(١) شەهوار: شاهوار، ئەوەی شایانی پادشاهان بێ.
(٢) وامیق: «وامیق»و «عەزرا» دۆست و دڵدارێکی بەناوبانگن وەك «قەیس»و «لەیلا». شاعیری بەناوبانگ «عنصری» رازەکەی هۆنیونەتەوە. چیهرە: روو. ئەڵێن ئەگەر منداڵ پەری ببینێ ئەترسێ و لەوانەیە شێت بێ.

نازانی ئەگەر چۆنە بەدەس دەردەوە حاڵی
وەك پووش و پەڵاشێکە بە دەم باوە دڵی من

لەو چۆڵ و بیابانە ئەبێ یاوەری کێ بێ
یا بەو کەژو کێوانەوە سەودا سەری کێ بێ
یا لەت لەت و ئەفگاری موژەی خەنجەری کێ بێ
چۆن ماوە لە سەد لاوە کە کوژراوە دڵی من(١)

بۆچی نەڕژێ سەیلی سروشکم وەکوو باران
بۆچی وەکوو یەعقووب نەبمە شوهرەیی شاران
لەو یۆسفە پرسیومە لە بێگانەوو یاران
هەرگیز نیە سوراخی لە هیچ لاوە دڵی من

بۆ خۆی بگریم یا نەفەسی پەردە دڕاوی
یا بۆ جگەری کون کون و سەد پارە کراوی
چی کردووە یا رەب، کە خەوو خواردن و ئاوی
دایم غەم و بیداری و خوێناوە دڵی من

چ بکەم، چ بڵێم، بۆ دڵەکەم کارییە دەردم
شاهێدی منن موویی سپی و چیهرەیی زەردم

---

(١) یاوەر: یارمەتی دەر. سەودا سەر: ئەوەی خەفەتت بخوا. ئەفگار: بریندار.

خۆڕایی نیەناڵەیی گەرمو دەمی سەردم
هەڵبەت بە بەڵاییکەوە ئاڵاوە دڵی من

ئەو سینە لە غەش خاڵییە، ئەو بێ رقو کینە
ئەو خادیمی شەرعی نەبەوی‌و میللەت‌و دینە
مەعلووم چووە بۆ خزمەتی سالاری مەدینە
وام زانی کە فەوتاوە، نەفەوتاوە دڵی من

قوربانی کەسێ بم کە بە قوربانی «نەبی» بێ
وەك بەندە سەگی دەرگەهی شاهی عەرەبی بێ
شاهی عەرەبی یەعنی قوڕەیشی نەسەبی بێ
جەرگی بە دوو ئەبرۆی ئەوە جنراوە دڵی من

زاتێکی وەهای گرتووە رۆحم بە فیدای ئەو
شاهان شەوو رۆژ دێنە قەدەم بۆسی گەدای ئەو
«بێخود» مەبە ئیتر بە ئومێدو بە تەمای ئەو
نایێتەوە لات گەر سەری داناوە دڵی من(١)

***

(١) قەدەم بۆس: قاچ ماچ کردن، [پا بۆس].

- ٤ -

ئەی بە ماڵو بە سەر فیدای وەتەن
وەی وەکوو کاکی خۆت برای وەتەن
دامەنی کامو دەستی تۆ دوورن
تا بە رۆح ئەبیە گەردی رای وەتەن
تا منو تۆ نەبینە پەروانە
شەوقی چۆن خۆش ئەبێ چرای وەتەن
حیشمەتی خوسرەوی مەحاڵە هەتا
جانی شیرین نەکەن فیدای وەتەن
بێ شرینقەی برایەتی هەرگیز
نیە چاری مەلارپای وەتەن
بێ «کنین»ی یەکیەتیو جیدی
زەحمەتە چاری لەرزو تای وەتەن
لە کەمانچەی سەری منو تۆدا
تا ببێ نەغمەیی هەوای وەتەن
ئاخری هەر بە یومنی لوتفی خودا
دێینە ژێر سایەیی همای وەتەن
یەعنی هەروەك درەفشەکەی «کاوە»
ئیشی خۆی هەر ئەکا لیوای وەتەن[1]

---

(١) درەفش: ئەو چەرمەی ئاسنگەرو پینەچیو شتی وا ئەیگرن بە بەر

دوڕڕو مـــەرجـانو کـارەبای کـوردان

نـــێرگسەو لالەیــەو گــیای وەتــەن

لەعلو زومڕووتو گـەوهەری ئـێمەن

زیــخو بــەردی کـەژو چـیای وەتـەن

بـە هـەزار تـەختی خـوسرەوی نـادەم

جــێگە پــێیێکی یـەك گـەدای وەتـەن

کــاسبو پــارە، زاهــیدو جــەننەت

«بێخود»و خاکی دڵ گوشای وەتەن(١)

***

---



سنگیانەوە. بۆیەش بە ئاڵاکەی کاوەی ئاسنگەری شۆڕشگێڕ ئەڵێن «درەفش کاویانی». لیوا: ئاڵا.

(١) دڵ گوشا: ئەوەی دڵی پێ بکرێتەوە.

# پیتی واو

- ١ -

له یـــارانـــی وەفـــاداران ئـــەدیبێکی «زەکـــی» مـــابوو
له پـــڕ پشـــتی له دنـــیا کـــردو رووی بـــۆ مـولْکی عـوقبا بـوو
«ئەمین»ی عاسیمەی غیرەت، «زەکی بـەگ» خـادیمی مـیللەت
دەبـیری مـەکـتەبی قـودرەت، وەزیـری شـاری «بـەغدا» بـوو
بـــە یـــادی زیـارەتی خـاکـی وەتـەن هـات بـۆ «سـولەیمانی»
کـــەچی نـــاگـــەه وەفـــاتی کـردو رۆحـی جـەننەت ئـارا بـوو
بـــلا بـا نـاڵە هـاودەم بـێ، قـەدی چـەشنی «ئـەلف» خـەم بـێ
«ضیا»ی رۆژی فەرەح کەم بێ، شەوی غەم زوڵمەت ئەفزا بوو[1]
له «بـێخود» سـاڵی کـۆچی ئـەو زەعـیمەم پـرسی‌و فـەرمووی:
«کَ بَـــدْرِ بُـــرْجِ عِـــرْفانُ مَـــعْارِف اِمْشَـــوْ آوْا بُـو»[2]

---

(١) بلا: لێی گەڕێ. زوڵمەت ئەفزا: تاریکی زیاد.

(٢) ئەم پارچەیە له لاواندنەوەی خوا لێ خۆش بوو «ئەمین زەکی بەگ»دا

- ٢ -

فەلەك ئیمساڵ لەگەڵمان هەر بە پەشمو کینو حیددەت بوو
بەراتی بۆ هەموو شێخو مەلا رەنجو مەرارەت بوو(١)
بەشی خەڵقی «بەهارە»ی بێ «مرۆر»ی سیححەتو شادی
بەشی ئێمەش هەموو «حاجی بەیان»ی دەردو میحنەت بوو(٢)
رەفیقێکمان هەبوو ئێمەی غەریقی بەحری زەحمەت کرد
بەڵام خۆی وەك دورڕی یەکتا سەدەف بەرداری رەحمەت بوو(٣)
ئیمامو واعیزی مزگەوتی پاشا «شێخ عومەر» یەعنی
خەلیفەی نەقشبەندی، خادیمی شەرعو دیانەت بوو
کە پرسیم ساڵی غوفرانی لە مامۆستای خیرەد، فەرمووی:
«امامێ بازی رۆحی ئاشیان ئارای جنّت بو»



وتراوە کە لە ساڵی ١٣٦٧ی هیجریدا کۆچی دوایی کردووە؛ وە ساڵی مەرگی بە حیسابی ئەبجەد ئەکاتە: «كَ بَدْرِ بُرْجِ عِرْفانٌ مَعْارِف اِمْشَوْ آوْا بُو-کە بەدری بورجی عیرفانو مەعاریف ئیمشەو ئاوابوو» بەو شەرتە وشەی «بَدر» بکەی بە وشەی «چواردە»، چونکە بەدر مانگی شەوی چواردەیە، وە "٢١٩"کە بەرامبەری وشەی «چواردە»یە لە جەمعی وشەکان لابەی، چونکە بە ئاوا بوو دانراوە. واتە: تێکڕای نیوە شیعرەکە بە حیسابی ئەبجەد ئەکاتە ١٥٨٦ وە ٢١٩ی لێ لابەرە.

(١) پەشم: رق. حیددەت: تیژیو توندی.

(٢) بەهارە: گەنمە بەهارە. مرۆر، حاجی بەیان: دوو دانەوێڵەی بێگانەن لەناو گەنمدا سەوز ئەبن.

(٣) یەکتا: تاقانە. بەردار: هەڵگر.

وەلی عەهدی لەپاش خۆی «شێخ محەممەد» بوو «بِحَمدِ الله»
لە عەسری خۆشیا هەر ئیشی تەدریسو ئیمامەت بوو
خودا کوێری نەکەی ئەو خانەدانی عیلمو عیرفانە
هەتا عالەم بمێنێ، چونکە هەر یانەی فەزیلەت بوو(1)

***

- ٣ -

دەمێکە وەك ژنی سك پڕ زەمانەیی بەد خوو
بە خوێنی سەیدو شێخو مەلا ئەکا بێزوو(2)
دەمێکە داسی ئەجەل تیژ ئەکا وەکوو «وەرزێر»
خەریکی عالەمە پاکۆی ئەدا بە ریزە هەموو(3)

---

(١) ئەم پارچەیە لە لاواندنەوەی خوا لێ خۆش بوو شێخ «عومەر»ی شێخ «محەممەدی قەرەداغی» ئیمامو مامۆستای مزگەوتی پاشای «هەڵەبجە»دا وتراوە کە لە ساڵی ١٣٧٣ی هیجریدا کۆچی دوایی کردووە، وە ساڵی مردنی بە حورووفی ئەبجەد ئەکاتە: «امامێ بازی رۆحی ئاشیان ئارای جنّت بو ـ ئیمامێ بازی رۆحی ئاشیان ئارایی جەننەت بوو».
(٢) بێزوو: حەز کردنی ئافرەتی دووگیان لە خواردەمەنییێکی تایبەتی.
(٣) وەرزێر: وەرزیار، کرێکارێکی کشتو کاڵییە کە تەنها لە وەرزی دروێنەو گێرەو کێشەدا لای خاوەن دەغڵو دان ئیش ئەکا بەرامبەر بە ئەندازەیەك لە بەرهەم، کە زیاتر وایە «شەش یەك» بێ؛ وەرزێر: لە کارو باری کشتوکاڵدا ئیشی [جووتیار] تەواو ئەکا. وە بەرامبەر بە هەردووکیان «مزوور» یا «رەنجبەر» هەیە کە ئیشی ماڵ ئەکا بە درێژایی ساڵ. پاکۆ: درەو.

دەمــــێکە دوخـــــتەرە لەم خـــەستەخانە کـــاولەدا
دەمێکە شەربەتی مـردن ئـەدا بـە جـامو سـەبوو(١)

وەها ئەسیری دەسی جەوری دەوری خوون خوارین
بـە چـنگی بـازو شـەهێنو هـەڵۆوە وەك تـەیهوو(٢)

ئـەگـەر بـبێ بـە «سکـەندەر» بـە بـازووی قـووەت
وەگــەر بــبێ بـە پـەلەنگەر بـە قـووەتی بـازوو(٣)

بە حوکمڕانـی ئـەگـەر بـبێ شـاهی «کـەیخەسرەو»
بە پاڵەوانی ئـەگـەر بـبیە «رۆسـتەم»و «بـورزوو»(٤)

ئەگەر بە زوهدو فەزیلەت بـبیتە شـێخی «جـونەید»
وەگەر بە حیکمەتو فەن ببیە «بو عەلی»، یا هوو(٥)

کە هاتوو رشتەیی عـومرت گـەیشتە وەخـتی پسـان
تەخەللوفی نیە «باللە»بە قەدری یەك سـەری مـوو(٦)

---

(١) دوختەر: دوکتۆر، پزیشك. سەبوو: گۆزە.
(٢) تەیهوو: پۆڕ، [پەلەوەرێکە].
(٣) پـەلەنگەر: شـازادەی قـولەکـان بـووە لەسـەر دەسـی ئـەسکەندەردا کوژراوە.
(٤) بورزوو: قارەمانێکی توورانی بووە لە سوپای «ئەفراسیاب»دا.
(٥) جونەید: جونەیدی بەغدایـی، لەخـوا تـرسی بـەناوبانگ. بـوو عـەلی: ئەبوو عەلی ئیبنو سینا، زانای بەناوبانگی ئیسلام. یا هوو: هۆکابرا!...
(٦) تەخەللوف، [تخلّف]: دواکەوتن.

لە خـــانەدانـــی ســەیادەت، لە دوودمـانی عـولووم
لە جێ هـەواری ســەخا حـاتەمێکی هـەڵکەوتوو[١]
جـەنابی حـەزرەتی «مـەعرووف ئـەفەندیی قـازی»
کە ئاشیانەیی شەهبازی ئەو بوو ئـەوجی عـولوو[٢]
درایـــێ روتـبەوو تــاجی ســەعادەتی ئــەبەدی
هومایی رۆحی فڕی بۆ بـەهەشتی خـولدی سـەروو
خــودا بـە مـەرحـەمەتی خـۆی مـەقامی عـالی کـا
بە جاهی سـیدرە نـوشینانی مـونتەهای ژووروو[٣]
کــە ســاڵی مـــەغفیرەتی ئـەو بـوزورگەیان پرسی
لە «بــێخود»ی لە عـەزا خـانەیی خـەما کـەوتوو[٤]
ئــەویش بـە گـریەوو ئـاه و هـەنسکی حـەسرەتەوە
حورووفی موعجەمەی ئەم شیعرە دواییەی فەرموو:
«هــەزارو نـۆسەدو ســیو هــەشت، فـەجر مـیلادی
هەزارو سێسەدو پـەنجاو حـەوت هـیجری بـوو»[٥]

***

---

(١) دوودمان: خانەدانو بنە ماڵەو هۆز.
(٢) ئاشیانە: هێلانە. ئەوجی عولوو، [عُلُوّ]: ئەوپەڕی بەرزی، ئاسمان.
(٣) سیدرە نوشینان: «سِدرَةُ المُنْتَهیٰ»، شوێنێکە لە ئاسمانا، مەبەست پێغەمبەرانە.
(٤) عەزا خانە: خانەی تەعزیە.
(٥) حەرفە نوختە دارەکانی ئەم دوو نیوە شیعرە بە حیسابی ئەبجەد ئەکەنە ١٣٥٧.

- ٤ -

هـاته بـەزمی ئـێمه دوێـنـێ شـەو بـرۆ داسـێ بـه دەو
هـەر بـه نـاكـامی پـەڵەی سـەبری دڵـی كـردم درەو
هات، ئەمما چی هات!؟ وەكوو گـوڵ دەم لەبالەب پێكەنین
چوو، ئەمما چی چوو!؟ وەكوو نێرگس دوو چاوی پڕ له خەو
خـوسرەوێكی وا بـه نـازو عـیشوه هـێند شـەكـری شكـاند
بـووم بـه فـەرهاد ئـاخری بـۆ گـفتو گـۆی شیرینی ئـەو
هەركه چاوی كەوت بـه ئـەبرۆی دەس بـەجی قـازی وتـی:
لێ بدەن مەیتەر كه ئیمشەو جـەژنه، دیـمان مـاهی نـەو(١)
گـەر بـه زەڕ بـۆی دەس بـدایـێ شـێخ تـەماشا كـردنی
زوو جـلو خـەرقەی ئـەنایه رەهـنو پـێناوی گـرەو
چـینی كـاكـۆڵی كـه پـەخشان بـوو بـەلای ملیا، وتـم:
سەر بیلادی شەرق ئەچێ وا دیاره هـۆردووی غـەربی شـەو
دڵ كـه كـون كـون بـوو ئـەبێ جـار جـاره رازی دەركـەوێ
دەنكه دەنكه نیسكو نـۆك هـەر دائـەدەن «بێژنگ»و «كـەو»
وەهـ چ خـۆشه تـا سـبەینێ دەم لەسـەر غـونچەی دەمـی
من وەكـوو «بـولبول» بـناڵم، ئـەو بـخوێنێ چـەشنی «كـەو»

---

(١) مەیتەر: سەرپەرشتی كەری ئەسپی سواری ماڵه گەورە. مەبەست له تەپڵ لیدانه، چونكه تەپڵی لەشكری ئاغا بەدەس مەیتەرەوە بووە.

قــەت بــە گــۆشتەوزوون نــەزانــی قـەرتماغەی زامــی دڵ
پێستەکەی لیَ لادە «بێخود» تــێ ئـەگـەی کـردوویە هـەو[١]

***

(١) قــەرتماغە: پــێســتێکــە ســەری بـرین دائـەپۆشـێ، لە یـەکێك وایـە گۆشتەوزوونی هێناوەتەوە، کەچی ژێرەوەی کیمو زووخە.



## پیتی هێ

- ١ -

ئـــەگـــەر شـــاهم، وەگـــەر شـــاهینو بـــازم «یـــا رســـول الله»

وەتــــەن ئــــاوارەوو هــــێلانەوازم «یـــا رســـول الله»(١)

بـــە رۆژ پـــەروانـــەیێکی دڵ شکـــاو و بـــێ پـــەڕو بـــاڵم

بە شەو شەمعێکی پڕ سـۆزو گـودازم «یـا رسـول الله»(٢)

لە تــێغی قــەهرو روتــبەی ئــیلتیفاتی تـۆوەیە قـوربان

ئـەگـەر گـەردەن کـەچم یـا سـەرفەرازم «یـا رسـول الله»

بە وەرچەرخاندنێکی رووت هەتا هەم کـەوتووم بـێ نـاز

بـــە لوتــفێکت لە عـــالەم بـــێ نـــیازم «یـا رسـول الله»

لە تــێکۆشینی رزگـــاری مـــنی ئـــاوارەدا کـــول بـــوون

هـــــەموو بـــاپیرەکـــانی دڵ نـــەوازم «یـــا رســـول الله»

---

(١) ئاوارە: غەریب. (٢) گوداز: توانەوە.

ئیتر هەر خۆت ئەبێ چارەم بفەرمووی چونکە هەر خۆتی
تکاکارم، موعینم، چارە سازم، «یا رسول الله»
ئەزانم خۆ خیلافی ئەمری تۆم زۆر کردووە، ئەمما...
کوڕی خۆتم بە لوتفی تۆ ئەنازم «یا رسول الله»
نەجاتم گەر بدەی زوو بۆ تەوافت حازرم، یەعنی...
بە کەعبەی رووت رووەو خاکی حیجازم «یا رسول الله»
غولامێکم ئەوا خۆم خستە قاپی غیرەتی تۆوە
بە ناو «مەحموود»م ئەمما هەر «ئەیاز»م «یا رسول الله»(١)

***

- ٢ -

گوڵی یاقووتە، تۆزی عەنبەری سارایە بەرزنجە
گیای زمرووتە، بەردی گەوهەری یەکتایە بەرزنجە(٢)

---

(١) ئەیاز: وەزیرەکەی «سوڵتان مەحموودی غەزنەوی».
ئەم غەزەلە بە ناوی خوا لێ خۆش بوو شێخ «مەحموودی حەفید»ەوە وتراوە، لە ساڵی ١٣٤٨ی هیجریدا کە بە حورووفی ئەبجەد ئەکاتە «هرچی بم اولادِ خۆتم ـ هەرچی بم ئەولادی خۆتم». شێخ لەو کاتەدا دیلی ئینگلیزە داگیرکەرەکان بووە.
(٢) عەنبەری سارا: عەنبەری بێ گەرد. «سارا» بە مەعنا ساغو بێ گەردە، وە لە «سەحرا»وە نەهاتووە، چونکە «عەنبەر» گیایێکی بۆن خۆشی دەلیاییە.

لەلای کوێر گەر بینای وەك دۆزەخە، ئەمما لەلای چاو ساغ...
وەکوو قەسرو قوسووری «جَنَّةُ المَأْوىٰ»یە بەرزنجە(١)
مەتافی یادگاری شێری یەزدانو «حُسَیْنَیْن»ە
زیارەتگاهی ئالی حەزرەتی «طاها»یە بەرزنجە(٢)
نەوەك هەر کانیاوی عەینی «شەهد»و «شیر»و «تەسنیم»ە
درەختیشی لەلای ئەربابی خۆی «توویا»یە، بەرزنجە(٣)
بڵێ رووی تێ نەکەن «دەججاڵ»و «فیرعەون»ی زەمان، «بێخود»
کە جەولانگاهی شێخ «عیسا»وو شێخ «مووسا»یە بەرزنجە

***

- ٣ -

کوردینە بە گەل بێنەوە وا وەختی سرووورە
وەختی گوڵو «رێحانە»وو «ئەسرین»و «چنوور»ە
بڕوانە گوڵشەن کە ئەڵێی «بۆقەلەموون»ە
گەه سەوزە، گەهێ زەردە، گەهێ ماویو سوورە

---

(١) مەبەستی لەوەیە کە بەرزنجە بە لاپاڵێکی تووشەوەیە، وەکوێر ناتوانێ بە ئاسانی ئەم ماڵو ئەو ماڵی تیا بکا.
(٢) شێری یەزدان: «اسدُ الله»، حەزرەتی «عەلی»ﷺ. [حُسَیْنَیْن]، حوسەینەین: حەزرەتی «حەسەن»و حەزرەتی «حوسەین»ﷺ مەبەست لە یادگاری ئەمانە: شێخ «عیسا»و شێخ «مووسا»ی بەرزنجەیە.
(٣) تەسنیم، [تَسْنِیم]: جۆگەیێکە لە بەهەشتا. تووبا: «شَجَرَةُ الطُّوبىٰ»، درەختێکە لە بەهەشتا.

بـــڕوانـــنە ئـــاونگ‌و گـــیا تـــاکـــوو بـــزانـــن...

ئەم هەروەکوو زمڕووتە، ئەویش چـەشنی بـلوورە

بـــڕوانـــنە دنـــیا کـــە ئـــەڵێی جـــەننەتە ئـــیمڕۆ

لایێ هەموو غـیلمانە، لەلایـێ هـەموو حـوورە(١)

«نێرگس» کە تـەماشاگـەهی سـەیران کـەرە ئـیمڕۆ

وەك چاوی بوتان خاوەنی سەد جـۆرە فـتوورە(٢)

خـزمینە ئـەگـەر بـاسی مـن‌و بـاوکم ئـەفەرموون

ئاغایە «سولەیمان»و «کەمال»یش وەکوو موورە(٣)

***

- ٤ -

دڵـــم مـــەفتوونی چـــاوی دوڵـبەرێکی نـــیکتە پـــەردازە

کە مەحزی حوسنە، عەینی شـۆخییە، سـەرچـاوەیی نـازە(٤)

لە بـــاغی نـــازکیدا مـــوعتەدیل سـەروێکی ســاوایــە

لە دیـــوانـــی چـــەمەنزاری دڵا فـەردێکی مـومتازە(٥)

---

(١) مەبەست لە کوڕان‌و کچانی سەیران کەرە.

(٢) فتوور: فیتنەو فتوور، ئاژاوە.

(٣) نەمانزانی «بێخود» ئەم شیعرەی بە زمانی کێوە وتووە.

(٤) مـەفتوون: گـیرۆدە، [دێوانـە]. نیکتە بـاز: نـوکتە ڕێکـخەر. مـەحزی حوسن، «مَحض حُسنٍ»: جوانی رووت‌و بێ گەرد.

(٥) موعتەدیل: [مُعْتَدِل]، نە درێژو نە کورت. چەمەنزار: جێگەی چیمەن. فەرد: تاقە شیعر.

بــه زۆری حــوسنی خــۆی ئـیقلیمی ئـەرزو ئـاسمانی گـرت
لەسـەر تـەختی زەمـین شـاهی زەمـان مـاهی فـەلەك نـازە(١)
سووەیدای پەرچەمی وەك فەجری «کازیب» زوڵمەت ئەفشانە
بەیازی گەردەنی وەك سـوبحی «سـادیق» پـوڕتەو ئـەندازە(٢)
هــەرێمی چــاو و بــەینی روومــەت‌و تـاقی خـەمی ئـەبرۆ
مــــەتافی نـــازە، کـــەعبەی ئـیمتیازە، قـیبلەیی رازە(٣)
لە بـــازاڕی مـــوحەبەتدا هــەزار لۆمــەم بکــەن ئـیخوان
ئــەڵێم ئــەم «یــوسف»ە، پــێغەمبەرێکی خــاوەن ئــیعجازە
دەخـــیلت بــم بــڵێ رازی دڵــی خـــۆی دەرنـەخا «بـێخود»
کە ئەم «کەرکووك»ە جێی راوی «شەهێـن»و «واشـە»وو «بـاز»ە

***

- ٥ -

کــەوسەر وەکــوو تـەنوورەیی چـاوی پـڕ ئـاومە
دۆزەخ وەکـــوو تـەنووری دڵـەی پـڕ هـەڵاومە(٤)

---

(١) فەلەك ناز: ئاسمان نازی پێوە ئەکا.
(٢) سووەیدا: رەشی. پوڕتەو ئەنداز: بڵاوکەرەوەی تیشك.
(٣) هەرێم: ناوچە. خەم: چەمیوە.
(٤) تەنوورە: گێژی ئاو لەو شوێنەدا کە لە بنەوە چاڵاییەك یا کونێك هەبێ ئاوەکەی پیا بچێ. هەڵاو: هاڵاو.

ئــاخۆ ئــەلەکــتریکە شــەوی کــردە عــەینی ڕۆژ
یــا خــۆ بــڵێسەی ئــاگــری کــوورەی بــە تــاومــە
لەنگــێزەیی بــەهارە کــە هــەڵساوە «خــاصّە»، یــا
فرمێسکی چاوی ســووری بــە خــوڕ دارڕژاومــە(١)
یــەك جــێگە پــێ نــەمایەوە بــۆ مــن زەمــینی دەیــم
یــــەعنی لە فــــەیزی گــــریەوە دنــیا بــەراومــە
بــۆنی کــەبابە، بــۆچەکــی چــزڵیکە دێ لە دوور
یــا بــۆ چــڕووکی جــەرگ‌و دڵــی هــەڵ کــزاومــە
هـــێلانە زەردەواڵــــە ورووژاوە بـــــەم شــــەوە
یــا گــرمە گــرمی ســینەیی کــون کــون کــراومــە
داخــی شکــستی دڵ نــیە ئــەیخۆم لە مــوددەعی
دەردی بــە بــەردی حــادیسە شــووشەی شکــاومە
غــەم واسیتەی حــەیاتی مــنی بــێ کــەسەو فــەقیر
غـــەم نـــان‌و ئـــاو و چـــایی‌و گـــۆشت‌و پــڵاومە
بەر بووم ئەگەر لە داوی تەعەللوق، ئەمما بە ڕۆح...
دڵ گورپە گورپی پەرچــەمی چــین‌و چــین‌و خــاومە

---

(١) لەنگێزە: وەرگیراوە لە «لەنگ»و «ڕێزە»، واتــە: دارڕژانــی تــای جــەواڵ‌و شتی وا. لێرەدا بە بارینی بارانی بە خوڕەم‌و دڵۆپ گەورە ئەوترێ. «خاصە»: شیوەکەی ناو [شاری] «کەرکووك».

وا تێ نەگەی لە رەعشەیی پیریمە ئەی جەوان
لەرزینی تیری غەمزەیی شۆخێکی لاومە
شۆخێ کە یادی ئارەقی بۆن خۆشی لاملی
قۆڵۆنیا و شووشەیی عەترو گولاومە
شۆخێ کە رابیتەی دەمەکەی پڕ لە خەندەکەی
خونچەی گوڵی بە ئاوی حەیات ئاو دراومە
شۆخێ کە یەك موژەی بە مەسەل بۆ زەبیحی من
سەد خەنجەری خەلیلی بە دایم سواومە(١)
پەروانە نیم کە عاشقی شەمعی کوژاوە بم
پەروای چرایی تاکوو ئەبەد هەڵکراومە
مەجنوونی لەیلی چاوی غەزاڵێکی «هاشمی»م
شاهید دەروونی چاکو یەخەی دادڕاومە
یوسف مەتاعی من نیە لێم لادە ئەی عەزیز
سەودای نگینی خەتمی ریسالەت بە ناومە(٢)

---

(١) ئیشارەتە بۆ مەسەلەکەی حەزرەتی «ئیبراهیم»علیه السلام کە ئەیویست حەزرەتی «ئیسماعیل»ی کوڕی بکا بە قوربانی بە پێی ئەو فەرمانەی کە لە خەوا پێی درابوو. پاشان کە ویستی فەرمانەکە جێبەجێ بکا خوا «مەڕ»ێکی بۆ ناردو لەجیاتی حەزرەتی ئیسماعیل علیه السلام ئەو مەڕەی سەر بڕی.
(٢) عەزیز: عەزیزی میسر. خەتمی ریسالەت...تاد: ئەو کەسەی کە پێغەمبەرایەتی بە ناوی ئەوەوە دوایی هێنراوە کە پێغەمبەری موسوڵمانانە، [حەزرەتی موحەممەد ﷺ].

بــۆ گــۆشەیێکی تـێغی بـرۆی وەك ژنـانی مـیسر
پــەیوەستە ئـارەزووی لەپـی دەسـتی بـڕاومـە[١]
بۆ زەڕڕە خاکی توربەتەکـەی رەشکـی جـەننەتی
یەك دەفعە بووم بە نێرگس‌و هەر چـاوە چـاومە[٢]

❊❊❊

ئــەو تـوربەتەی کـە سـە یـقەلی مـیرئاتی چـاومە
ئــــیکسیری قــــەلبی مــــەعاسی خــوراومــە
ئەو توربەتەی کـە خـۆڵ‌و گـڵ‌و وردە بـەردی ئـەو
ئــــاڵتوون‌و زیــــوو لیــرەوو غــازی‌و دراومــە
ئەو توربەتەی کە تۆزی ئـەگـەر بـێتە سـەر سـەرم
نایدەم بە تاجی «خوسرەو»و «جەم» گەر کڵاومە[٣]
ئەی بـازی سیدرە تـۆبی خـودا بـۆچی نـاگـری
نــێچیرەکــەت کــە پــۆڕی دڵــی هــەڵفڕاومــە
هـەر فـیکری تـۆیە بـاعیسی ژیـن‌و حـەیاتی مـن
هــەر زیکــری تــۆیە قــووەتی ئـەژنۆو هـەناومە
هەر وەسفی رووتـە هـەر قسـەیێ وا لەسـەر زمـان
هــەر سـەرفی مـووتە هـەرچـی خـەیاڵی بـڵاومە

---

(١) ئیشارەتە بۆ مەسەلەکەی حەزرەتی «یۆسف»علیه السلام کە ئـەوەبوو ژنـانی گەورەی میسر کە دیان، لە تاو جوانی ئەو بەری دەستی خۆیان بڕی.
(٢) رەشك: داخ‌و حەسرەت. واتە: ئەو خاکەی کە بەهەشت بـەخێڵی پـێ ئەبا.
(٣) جەم: جەمشید.

هەروەك منداڵە کوردێ کە ون بێ لە باوکی
ئەگریم بەرەو «مەدینە»وو هەر باوە باوەمە
مەڕوانە چاوی تەڕ، بە خودا زۆر خەجاڵەتم
گریان نییە، دڵۆپی حەیاکەی تکاوەمە
باکم لە دانەنیشتنی مەنهی نییە، بەڵام
ترسی بە ئەمری حەزرەتی تۆ هەڵ نەساوەمە[1]
چاکەم بە دەست خراپەوە هەر زاکو زووکیە
چ بکەم پەرۆشی ماڵی بە تالان براوەمە
سا تۆش بفەرموو: خادیمەکەی دەرکو بانی خۆم
پەت کەن کە چونکە ئەو سەگی قول هەڵکراوەمە
یەعنی بە شەو ئەگەر سەگە، ئەیکەم بە توولە رۆژ
ئەم سەگ بە توولە کردنە بۆ پاس و راوەمە
من چونکە غەیری شیعرو غەزەل هیچی کەم نیە
بۆ خزمەتت هەر ئەم دووە دیاری نراوەمە
دایم لە سەییدم ئەمەتە جائیزەم بڵێ:
«بێخود» قولی بە نەقدی شەفاعەت کراوەمە[2]

***

---

(١) واتە: ترسی ئەوەم نیە کە خراپەم کردبێ، چونکە نەم کردووە، بەڵکوو ترسی ئەوەم هەیە کە چاکەم نیە.
(٢) ئەم پارچە هەڵبەستە لە پاڕانەوەدا لە پێغەمبەرﷺ وتراوە لە ساڵی ١٣٤٥ی هیجریدا.

- ٦ -

سوبحی فەروەردینە ئەمڕۆ، بولبولی دڵ بێ غەمە
گەر لە خۆشیا رۆحی دەرچێ باخەوان هێشتا کەمە[١]
هەر دەڵێی غیلمانو حوورن نەو عورووسانی چەمەن
رووی زەمین جەنناتی عەدنە، هێندە تازەو خوڕڕەمە
وا لقی «لاولاو» بە قەد «سەرو»ی رەوانا هەڵچووە
بۆ لە باوەش گرتنی باڵای بتان وەك پەرچەمە
گوڵ خەریکی رەنگو بۆ یەعنی شەبیهی روومەتە
خونچە مەشغوولی تەبەسسوم، هەر دەڵێی لێوو دەمە
زەمزەمەی «سار»و «کەبووتەر» وەك نەوای نایو نەیە
هەمهەمەی «دورڕاج»و «قومری» راست ئەڵێی زیرو بەمە[٢]
بێنە ناو بەزمی چەمەن دنیا ببینن سەر بەسەر
نەشئەیی «نَظّارە»یی «نێرگس» ئەڵێی جامی جەمە[٣]
با نەدوین ئیتر لە ئەستێرەی شکۆفەی بورجی باخ
بێینە سەر ئەوسافی «نجم الدّین» کە بەدری عالەمە[٤]

---

(١) فەروەردین: یەکەمین مانگی [هەتاوی ـ شمسی] بەهار.
(٢) سار: باڵدارێکی رەشی دەنگ خۆشە، وردە خاڵی سپی پێوەیە. کەبوتەر: کۆتر. دورڕاج: پوڕ، [ئەم دوانەش هەریەکە جۆرە باڵدارێکن]. زیرو بەم: دوو ئالەتی مۆسیقان. (٣) نَظارَة: تەماشاکەران.
(٤) نجم الدّین: شێخ «نجم الدّین»ی کوڕی شێخ «ضیاء الدّین»ی عوسمانی.

چـــونکە مـــیعماری تـەریقەت بـاوکو بـاپیری ئـەون
بـــۆیە دیـــواری حـــەساری «نـەقشبەندی» مـەحکەمە
رۆحـــی «هـود هـود» بـۆ قـوربانی دەمو لێـوی نـەبێ!؟
وەك «ســـولەیمان»ی زەمـــان ســاحێب نگـینو خـاتەمە
بــــۆ لە یـومنی مـەقدەمی سـەرتان نـەگـاتە ئـاسمان!؟
جـــیلوەگــاهی ئــافتابی ئــێمە عــەرشی ئـەعزەمە
خـەڵقە بـۆ نـاچن لەبـۆ «رَوضـە»ی «بیارە» بۆ تـەواف؟
خــاکـی وەك خــاکـی «بـەقیع»ە، ئـاوی ئـاوی «زەمـزەم»ە
نـەك بـە تـەنها قـەیسەری «رۆم» خـادیمی دەرگـای ئـەوە
بـۆ سـوجوودی حـاجیبی خـاقانی چـین پشـتی خـەمە(١)
نـێرگسی ئـەو تـا تـەبیبم بـێ چ بـاکـم زەخـمە مـن
بــــۆ بــرینی «ظـــاهِر»و «بـــاطِن» نـیگاهی مـەرهەمە
هـێندە بـۆ ئـیحیای دڵـی مـردوو یـەدی بـەیزای هەیە
«گاور»و «جوو»ش پێی ئەڵێن «مووسا» دەسەو «عیسا» دەمە(٢)
ئـلتیفاتی شـاهی مـن بـۆ دۆستو دوژمـن وەك یـەکـە
خـــزمەتی «سِــیّان»ە، گـەر بـێگانەیە یـا مـەحرەمە(٣)

---

(١) حاجیب: دەرگەوان. خەم: چەماوە.
(٢) [یەد: دەست]. ئیشارەتە بەوە کە حەزرەتی «مووسا»علیه السلام کە دەسی ئەکرد بە باخەڵیاو دەری ئەهێنا ئەگڕاو شەوقی ئەدایەوە، [یَد بَیْضاء]. وە حەزرەتی «عیسا»علیه السلام کە فووی لە مردوو ئەکرد زیندوو ئەبووەوە.
(٣) «سِیّان»: وەك یەکن، [مساوی].

خــاکــی بــەرپێی ئــەو بــە «بێخود» گــەر بــە ریــفعەت تــالبی
دەس بــە داوێـــن گــرتنی بــۆ بــانی عــیرفان سـوللەمە(١)

***

- ٧ -

لە ســایەی نــەخلی تــووبای قــامەتی ئـەو نـەو نـیهالانە
«ســلێمانی» بــەهەشتی عــەدڵە، یــەعنی پڕ لە غـیلمانە
دڵــی زاهــید بــە جــارێ بۆ نـەبێتە بـوڵبوڵو قـومری!؟
لەلایــەك گــوڵ، لەلایــەك جـیلوەیی سـەروی خـەرامـانە
«عەلی» کەیوانە، «تەوفیق» زوهرەیە، «نـووری» شـەباهەنگە
«عــەزیز خــان» ئـافتابی حـوسنە، «فـائیق» مـاهی تـابانە
بە یادی خـەندەیی ئـەو بـۆ نـەژی غـەوواسـی دڵ، یـاران
«عەلی» یـاقووتی یـاقووتە، «عـەلی» مـەرجـانی مـەرجـانە
وەها بازاڕی حوسنی گەرمە «تەوفیق»، وەك «عەزیز»ی خۆم
خــەریکی رۆحــە بــیدا موشتەری گـەر مـاهی کـەنعانە
بە سەربەستی مـەڕۆ ئـەی «بـیژەن»ی دڵ بـۆ نـەزەر بـازی
مەگەر نازانی «نـووری» سـاحێبی چـاهی زەنـەخدانـە(٢)

---

(١) [سوللەم، «سُلَّم»: پەیژە]. بێخود ئەم قەسیدەیەی بۆ خوا لێ خۆش بوو شێخ «نجم الدّین»ی بیارە وتووە.
(٢) چاە: چاڵ. زەنەخدان: چەناکە. بیژەن: لە قەسیدەی دووهەمی «پیتی میم»دا بە درێژی لێی دواین.

ئــەوە روخســـارە یــاخۆ قــیبلەیی حــاجاتی ئیسلامە!
ئەوە میحرابـە، یـا تـاقی خـەمی ئـەبرۆی «عـەزیز خـان»ە
لە توڕڕەی کافری «فائیق» مـەدەن ئـەی ڕەهـڕەوانـی دیـن
ئــەوەندەی لێ ئــەزانــم ڕەهــزەنی کـاروانـی ئیمانە[1]
لە عـەبدێکی وەکـوو مـن گـەر ئـەپرسن سـەییدت کـێیە؟
...ئــەمیری مـالیکی جـان، یـەعنی شـاهەنشاهی خـووبانە
یـەدی بـەیزای بـەغەل پـەروەردەیی ئـیعجازی شـۆخێکە
لە عــەینی فـەسڵی شـەودا سـاحێبی سـوبحی گـریبانە[2]
زەمانی نـەزعە، تـوخوا لێـم مـەپۆشە، چـاوەکـەم چـاوت
پــیاڵەت بـێنە گـەردش سـاقیا، سـا وەخـتی ئـیحسانە[3]
ئــەوەندە وەســفی لەعــلی لێـوی شیرینی ئـەمانەم کـرد
کەلامم بۆیە وەك «بـەنغاڵ»ە، «بـێخود» شـەککـەرستانە[4]

***

(١) ڕەهڕەوان: پێشەوایان.
(٢) بەغەل پەروەردە: لە باخەڵدا پەروەردە کراو. ئیشارەتە بـە دەسـتەکـەی حەزرەتی «مووسا»عليه السلام کە لە قەسیدەی پێشوودا باس کرا. گریبان: یـەخە، رووبە روو هاتوو. (٣) نەزع: گیان دەرچوون.
(٤) بەنغاڵ: نـاوچەیەکـە لە «هـیندوستان»، مـەشهوورە بـەوە کـە قـامیشی شەکری زۆری تیایە.

- ٨ -

بە شەو دەرزی موژە مەشغوولە یەعنی چاك ئەکا سینە

بە رۆژ چۆغەی دڵی عالەم ئەدا ئەو شۆخە ماکینە

وەها پەرچەم ئیحاتەی دەوری جەبهەی داوە رۆژو شەو

ئەڵێی تەسخیری موڵکی رۆم ئەکا ئەم حاکمی چینە

کە پێی هێنایە باغی دڵمەوە یارم بە دەستی ناز

گوڵی سەبری چنی یەك دەفعە ئەو بێ رەحمە گوڵچینە

لە تەحریکی مەکینە هاتە گوێم دەنگێ بە سۆز ئەیوت:

خوا بمکەی فیدای ئەو ساعیدو ساقی بلوورینە

بە ئەبرۆی وسمە رەنگی کوشتمی، خوێنم مەفەوتێنن

گەواهم بۆ سبووتی موددەعا شمشێری خوێنینە

لە شەوقی ئینعیکاسی خاڵی ماوی ئەو کەوا تاقە

لەبەر نیلۆفەری ئەنجوم زەمین وەك ئاسمان شینە[١]

هەناسەی لێوی لالەی کێیە وا رەنگی بەهاری رشت

کە ئەم دنیایە یەکسەر باغە، ئەم سەحرایە رەنگینە

خوا بمکەی بە پۆڕێ ئاشیانم مەنزەری ئەو بێ

کە شایەد ببمە «صەید»ی غەمزەیی ئەو چاوە شاهینە[٢]

---

(١) نیلۆفەڕ: ناوی گوڵێکە. ئەنجوم: ئەستێرەکان.

(٢) ئاشیان: هێلانە. مەنزەر، [مَنْظَر]: جێگای تەماشا.

به وەسڵی ئەو نیگارە بێ ڕەقیب زەحمەت بگەی «بێخود»
لە دنـیادا کـەسێ بـێ ئـەژدەها نـەیدیوە گـەنجینە(١)

***

- ٩ -

تا لە من ئەو ماهی چاو بە خومارە خۆی ون کـردووە
تیفلی دڵـمی تووشی بـیماری سـەرو بـن کـردووە(٢)
من لە حەڵقەی خەتمی نازا زۆر هیلاکـی غـەمزە نـیم
رابیتەی ئەبرۆ جگـەرمی ئـەنجن ئـەنجن کـردووە(٣)
قەت بە بیداریم نەدی تـالیع، ئـەڵێی مـامانی دەهـر...
گۆشی ئەم منداڵـە بـەدبەختەی بـە نـووستن کـردووە
تـۆ خـودا بـا هـیندە بگـریم تـا بـزانـن «شـارەزوور»
سەیلی فرمێسکی من ئاوی «زەڵـم»ی لیـخن کـردووە

---

(١) مـەشهوورە هـەر گـەنجینەیێکـی شـاراوە ئـەژدەهایەك پەپکەی داوە بەسەریەوە.
(٢) سەرو بن: نەخۆشییێکە لە سەرو بنی مانگا تووشی مناڵ ئەبێ.
(٣) هـەوادارانـی تـەریقەتی «نـەقشبەندی» حـەڵقـەی خـەتمیان هـەیە کـە رابیتەی تیا ئەکەن، واتە: بەیانیانو ئێواران کۆ ئەبنەوەو حەڵقە ئەبەستن بیر لە خواو لە پیرانی تەریقەتو پیری سەردەمی خۆیان ئەکەنەوە.

خوا له «دزیایش» هەتا «ئەحمەد برِنده»و تـا «پـریس»
تا «عەبابەیلێ»و «هەڵـەبجە»ی قیبله بۆ من کـردووه[(١)]

ئەی فیدای رەحمو وەفاتان بم، مـەگـەر مـن یـۆسفم
ئـــەم بـــرای خـــۆتانه وا ئـــاوارەوو ون کـــردووه

ئێوه عیلمو «فی المثل» بـەندەش مـەلا، بـێ ئـیختیار
خوا منی بۆ خـوانـی وەسـڵی ئـێوه نـەوسن کـردووه

گەر کـەتانو رۆژ پـەرستی ئـێو نـیم، بـۆ رۆژو شـەو
رووم له مانگو رۆژی «وارمـاوا»وو «بـێدن» کـردووه

نـــامەتان نـاییێتو ئـەشزانـن کـه چـاو رێـژی ئـەزەل
چـــاوی تـاریکی مـنی بـەو سـورمه رۆشـن کـردووه

هێنده بێ رەحـمن ئـەڵێی ئـاسنگەری رۆژی «أَلَسْت»
دەرحـــەقی مـن لەوحـی دڵـتانی له ئـاسن کـردووه[(٢)]

گەر ئەپرسن چۆنه «بێخود»؟ درِكو داڵی دەشتی عیشق
دوور له ئـــێوه پـــێی دڵـــیشی دەرزی ئـــاژن کـردووه

***

---

(١) دزیایش: جێگەی مامۆستا مـەلا «قـادر»ی سـۆفـیو ئـەحمەد بـرِنـده: جێگای شێخ «عبد الکریم»و پـریس: جـێگـای مـامۆسـتا مـەلا «عـەزیز»و عەبابەیلێ: جێگای مامۆسـتا شـێخ «بابا رەسـوول»و هـەڵەبـجه: جـێگـای مامۆستا شێخ «رەسوول» بووە، که دۆستی بێخود بوون.
(٢) رۆژی «أَلَسْتُ»: ئەو رۆژەی که خوا دنیای دروست کردو له ئەرواحـی خەڵکی پرسی: ﴿أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْ﴾؟ [ئەوانیش وەڵامیان دایەوەو وتیان: «بَلي»].

- ١٠ -

ئەی دڵ لە داخی ئەو مەهە بتلێ بە دەردەوە
برژێنە ئەشکی گەرم بە دەم ئاهی سەردەوە
دەرچوو بە داخی عەشقەوە رۆحی رەوانیان
فەرهاد بە بێستوونەوە، مەجنوون بە هەردەوە
گەر وەسفی گەنجی رووی ببێ جارێ باخەوان
وێران ئەکا چەمەن بە هەموو دارو بەردەوە
شۆرێ بە یادی لێوی بڵێ ئەی «حەمەی عەلۆ»
ئەمما بە شیعری مونتەخەبو بەیتی فەردەوە(١)
«بێخود» لەباتی سورمە لەسەر چاوی دائەنێ
ناڵی وڵاخی ئەو بە هەموو تۆزو گەردەوە

***

- ١١ -

لاواندنەوەی «کەریم بەگ»ی حاجی «عبداللە»ی کەرکوکلی زادە

بەندی یەکەم

دیسان لە ئێمە قاپییەکەی غەم کرایەوە
دەرگای تەرەب لە عالەمی دڵ داخرایەوە

---

(١) شۆر: مەقامی شۆر. حەمەی عەلۆ: گۆرانی بێژێکی مەشهوور بووە لە سەدەی رابوردوودا لە «سلێمانی».

دیســــــان جگـــەر کــرا بــە قــەنارەی مــوشەققەتا
یــەعنی دووکــانی چــەرخــی جگـەرچــی کـرایـەوە
دیســـان بــرینی کــۆنی غــەمی ئــێمە هــاتە سویْ
جــامی فــەرەح بــە بــەردی «حَــوادِث» شکـایەوە
دیسان دوو چاوی سووری وەتەن بوو بە گۆمی خوێن
فـــرمێسك وەکـــوو فـــوارە لە دڵ هــەڵقوڵایەوە
دیســــان لیــــوای عــەزا لە لیــواو نــاحیەو قــەزا
بۆ کــوردی قــوڕ بـەسەر بـە مـەسەل هـەڵکرایـەوە(١)
ئــەستێرەییێکی بــورجــی حـوقووقی هـەبوو وەتـەن
ئــیمشەو لە پــڕ کشـا و بــە جــاریْ کــوژایــەوە
داخــی غــەمی فــیراقــی کــە دانــا لەسـەر جگـەر
زامـــــی هــــەزار ســـاڵەیی دڵ واکـــولایەوە
گـــــریاو وتــی: وەتــەن جگــەری مــن بــڕایــەوە
شـــەوقی چــرایــی مــەجلیسی غـیرەت کـوژایـەوە

***

بەندی دووهەم

ئەی چەرخی بەد موعامەلە تاکەی خـەتا ئـەکـەی!
ئــەم کـوردە بـێ کـەسانە بـە غـەم ئـاشنا ئـەکـەی!

---

(١) لیوای عەزا: ئاڵای پرسە.

دەغڵی وجوودی ئێمە هەتاکەی ئەکەی بە ئاردا
خەرمانی عومری ئێمە هەتاکەی بە با ئەکەی!
جەرڕاحیو، کەچی ئەکوژی عالەمێ بە غەدر
گۆیا برینی کۆنەوو نوێمان دەوا ئەکەی!
مەعشووق ئەکەی بە دوشمنی عاشق وەکوو رەقیب!
باوك لە کوڕ ئەکەیتو برا بێ برا ئەکەی!
کوردی فەقیر ئەبێ چ گوناحێکی کردبێ
هەر لەحزەیێ بە سەد ئەلەمی موبتەلا ئەکەی
«عبد الكريم» کە دوێنێ لەسەر تەختی «ئینفیراد»...
حاکم بوو، ئەمڕۆ مەسنەدی داری فەنا ئەکەی[1]
ئەم دایکی کوردی قوڕ بەسەرەت خستە «تەعزیە»
ئەولادەکانی چونکە دوچاری بەڵا ئەکەی
ئەگریو ئەڵێ: وەتەن جگەری من بڕایەوە
یاران چرایی بەزمی حەمییەت کوژایەوە[2]

***

بەندی سێهەم

ئەی خاکی تیرە دڵ هەیە گەر زەڕڕەیێ حەیات
ڕۆحت ئەکەیتە خادیمی سەرچاوەکەی حەیات

---

(١) واتە: حاکمی مونفەرید بووە. (٢) حەمییەت، «حَمیّت»: غیرەت.

زوڵمەت نەدیدە چونکە گەیشتی بە ئاوی «خضر»
تۆ نامریتو عالەم ئەکا یەك بە یەك وەفات[(١)]
ئەو حاکمەی کە مەرکەزی قانوون بوو سنگی ئەو
راجیع بە تۆیە قوڕ بەسەر ئەهلی موڕاجەعات
ئەو حاکمەی کە عەینی وەفا بوو، حقووقی مەحز
تەرکی سەریری مەعدەلەتی کردو هاتە لات
تۆش تۆ خودا وەرە وەکوو تێ گەییوەکانی کورد
تەقسیر مەکە لە خزمەتی، ئەی رۆحەکەم فیدات
چەند ئەهلی غەدرو زاڵمی بێ دینی کرد ئەسیر
چەند بێ گوناحی دا لە حەپسخانەدا نەجات
زاتێ کە وا لە ماتەمی ئەودا بێ ئەهلی فەزڵ
چونکی لە زایعاتی وەتەن بوو، لە زایعات[(٢)]
ئەگریو ئەڵێ: وەتەن جگەری من بڕایەوە
شوعلەی چرایی مەجلیسی عیرفان کوژایەوە

***

(١) ئیشارەتە بەوە کە «خدری زیندە» ئاوی حەیاتی خواردووەتەوە بۆیە نامرێ، وە بەوە کە ئەڵێن ئاوی حەیات لە تاریکییەکدایە.
(٢) واتە: نیشتمان بە هۆی فەوتانیەوە فەوتا.

### بەندی چوارەم

ئەی بوڵبوڵی گوڵی وەتەن، ئەی باغەوانی کورد
ئـەی باعیسی نیمایی درەختی ژیانی کورد
ئەی واسیتەی تەرەققی میللەت بە ماڵو رۆح
سەر دەفتەری جەمیعی فیداکارەکانی کورد
زەحمەت کە خۆش ببێتەوە تا رۆژی رەستخێز
داغی غەمت لە جگەر سەروەرانی کورد[(١)]
بۆ غیرەتو وەفاو و حقووقت لە ماتەمان
گەورەو بچووکی میللەتو پیرو جەوانی کورد
ئەوراقی سەبری ئێمە بە جارێ دڕیت، درێغ...
رۆیی بەهاری عەیشو پەیا بوو خەزانی کورد
تا مولکی ئاوەدانی بەقا بوو بە مەنزڵت
وێرانەکەی عەدەم بووەتە جێو مەکانی کورد
تابوتی تۆی کە دی وەتەن ئەمڕۆ بە چاوی خۆی
پشتی شکا کە عەشرەتی ساحێب نیشانی کورد
گریاو وتی: وەتەن جگەری من بڕایەوە
ئیمشەو ئەلکتریکی شەوی من کوژایەوە

***

(١) رەستخێز: [رَستاخیز]: راپەڕین، مەبەست لە رۆژی قیامەتە. جگەر: جگەری.

- ١١ -

«بێخود» کەوابە جانو دڵ ئـەی خـواجـە بـەندەیە
بەندەی وەفای شێخەکەی «ئەحمەد بـڕندە»یـە[(١)]
«عــبد الکــریم»ی خـۆم کـە لە بـاخی مـەحەبیەتا
وەك گوڵ بە رووی هەموو کەسەوە دەم بە خەندەیە
ڕۆحم لە خۆشی قاقەزەکەت زوو کە دەر نەچوو...
جان سەختە، تیرە بەختە، نـەفامەو سـەهەندەیە[(٢)]
یا شـێتی عـەشقی دوڵـبەرە ئـاگـای لە خـۆی نـیە
یــا وەحشـــییێکە هـەمدەمی دەعـباو دوڕنــدەیە
تـریاقی نـامەکـەت کـە گـەیی «بـێخود»ی سـەلیم
بــاکـــی لە مـاری غـەم نـیە گـەرچـی کـوشندەیە

***

- ١٢ -

بێ قەدی تووبایی تۆ ســەروی ڕەوانـم بـۆچیە!؟
جەننەتی فیردەوس‌و عومری جاویدانم بۆچیە!؟
تا موژەو ئەبرۆی جەوهەرداری تۆ بێ ئەسڵەحەم
خەنجەری قەزبین‌و شـمشێری دەبـانم بـۆچیە!؟

---

(١) خواجە: خاوەنی بەندە.
(٢) جان: گیان. تیرە: تاریك.

ڕۆژی وەسڵت هەر سبەینێیە کەوا پڕتەو نەدا
مـن لە تـاریکی شـەوی هـیجرا ژیـانم بـۆچیە!؟
سەیری تۆی گەر پێ نەکەم کوێربم، ئەگەر چاوم بوێ!
وەسفی تۆی گەر پێ نەکەم لاڵ بم، زمانم بۆچیە!؟
تا بەهاری ڕووی گوڵڕەنگت بڕێژێ ڕەنگی حوسن
«سونبول»و«نەسرین»و«لالە»و«ئەرخەوانم»بۆچیە!؟
بۆ قەدی هەروەك عەسایە غەیری قومری مەشرەبان
هـیچکەسێ نـازانـێ ئـاهی نـاتەوانـم بـۆچیە!؟
جێگە گازی من هەتا ئەو ڕوومەت و ئەو لێوە بـێ
«سێو»ی«سەردەشت»و«هەنار»ی«شارەبانم»بۆچیە!؟
تۆ کە چاوت پێم بڵێ دەرسی زوبـانی ئـەجنەبی
وەك«موفەتتیش بەگ»ئیتر من تەرجومانم بۆچیە!؟(١)
یار کە فەرمووی بێرە باغی ڕوومەوە بۆ گوڵ چنین
«بێخود» ئیتر ئیزن و پـرسی بـاخەوانـم بـۆچیە!؟

***

- ١٣ -

قـەت بـە دنـیا دڵ مـەدەن جـادووگەری ئـێرانییە
سـینەماییکی پـڕ ئـاشووب و فـریب و ئـانییە(٢)

---

(١) مەبەستی لە موفەتتیشی «ئینگلیز»ە لە سەرەتای داگیر کردنی سلێمانیدا.
(٢) ئانی: کات کات و بێ بار.

قەت بە خۆشیو ئاشنایی‌و دۆستی باوەڕ مەکەن
گەر تەماشا کەن ئەزانن دوژمنێکی جانییە
هەرکە ڕۆژی عومری هەرکەس هاتە ئاوابون، ئەجەل
مۆڵەتی نادا قەسەم بەخوا بە قەد یەك سانیە
خاوەنی شان‌و شەرەف «میرزا فەرەج» ئالی شەریف
تاکو دوێنێ بوو مەلیك، ئیمڕۆ مەلەك میوانیە(١)
بەسیە ئەم نیو شیعرە بۆ تەئریخی کۆچی ئەو کەوا...
«دەست‌و دامێن‌گیری "عبد القادری گەیلانی"یە»(٢)

***

- ١٤ -

ئەمە بۆی نەسیمی بەهارە، یاخەبەری سرووشی هەواییە
دەمی ڕۆح بەخشی نیگارە، یانەفەسی مەسیحی سەماییە(٣)
کە دڵی بە عوقدە کرایەوە گوڵی ناشکوفتە گەشایەوە
نە ئەوەو نە ئەم، نە ئەمەو نە ئەو، هەموو موعجیزاتی خوداییە(٤)

---

(١) واتە: تا دوێنێ گەورە گەوران ئەهاتنە لای، کەچی ئەمڕۆ فریشتەی پرسیاری قەبر لەلایەتی.
(٢) ئەم پارچە شیعرە بەبۆنەی کۆچی دوایی «میرزا فەرەج»ی حاجی شەریفەوە وتراوە کە لە ساڵی ١٣٧٣ی هیجریدا مردووە.
(٣) سرووش: وەحی، [نیگا]. نیگار: وێنە، مەبەست لە جوانییە. نەفەس: هەناسە.
(٤) بە عوقدە: ئاڵۆزو خەفەتبار. ناشکوفتە: نەپشکووتوو.

دەمـــی ئـیبتیدایـی مـەسەڕڕەتە، نـەفەسی نـیهایەتی مـیحنەتە
لە هـــەموو مـحاڵەوە عـوشرەتە، لە هـەموو وڵاتـەوە شـاییە(١)

خـــەبەری قـــودوومی کـەسێکە وا کـە ئـەکـا بـرینی دڵان دەوا
کە لەبۆ جیهادی کولەی هەوا لە تـەرەف خـوداوە غـەزایـیە(٢)

قـــەمەری ســـەمایی ســـەیادەتە، حـەجەری بـینایی ڕەشـادەتە
گوهەری هومایی سەعادەتە، دوڕڕی تاج و ئەفسەری شـاییە(٣)

ئەسەری حەبیبی ڕەسوولە ئەو، جگەری نەجیبی «بەتوول»ە ئەو
سەمەری «قَضیب»ی قەبووڵە ئـەو، گـوڵی بـاغی ئـالی عـەباییە

ئەتەوێ ئەگەر گوڵی سەرمەدی، وەرە باخی نەعتی موحەممەدی
بـــبە بـــوڵبوڵێکی مـــوئەببەدی، ئـــەمە شـێوەیی ئـودەباییە

لە تەریقیا نـیە خـوسرەوێ، کـە نـەبێ بـە خـاکـی قـەدەم لەوێ
بە خەیاڵی خۆی کە دەسی کەوێ، بە تەمای مەقامی گەدایـیە(٤)

مەلەکەو بە شاپەڕی سەوزەوە شەوو ڕۆژ خەریکە گـەسك ئـەدا
فەلەکەو بە کوندەیی هەورەوە هەموو ئیش و کـاری سـەقاییە(٥)

---

(١) مەسەڕڕەت: شادی. محاڵ: ناوچە.
(٢) غەزایی: کەسێك کە چووبێ بۆ غەزا.
(٣) ئەفسەر: تاج.
(٤) واتە: گەورە گەوران، کەوتن لەبەر پێی ئەوا بە پادشاهی ئەزانن.
(٥) کوندە: کونەی ئاو. سەقایی: ئاودان.

دڵو جەرگی «بێخود» ئەگەر لەتە، بە خودا بە تـێغی مـەحەبەتە
بە ئومێدی شەهدی شەفاعەتە، سەرو ماڵو ڕۆحی فـیدایـییە(١)

***

(١) شەهد: هەنگوێن.

## پیتی یێ

- ١ -

بــــرا، خــۆ تــۆ لەلای خــۆت مــەخزەنی عــەقڵ و کــەماڵاتی!
کـــــەچی تـــــا دەوڵـــــەمەنتر بــی فــەقیرو ســـواڵکـــەرو لاتـــی
بــە تــەحریکی هــەوا دێـیت و دەچـــی چــەشنی شــەپۆلی ئـاو
ســـــەراپـــا غــەرقی گــێژاوی غــەم و بــەحری خــەیاڵاتی[(١)]
ئەگەر «ماضی»ت لە دەس چوو هێندە بێ حـاڵیشی ئـەی غـافڵ
لە «ئـیستیقباڵ»ی خــۆت ئـاگـات نــیە چـوون بـێ مـوبالاتی
بە قەسری رووی زەمین تێر نـابێ، قـەت چـاوت وەکـوو فـیرعەون
خـــوا دەســـتت نــەدا، دەســتت بــبێ روو بــۆ ســەماواتــی!
بـــە جـــاهی خـــۆت مــەنازە، رۆســتەمی قــابیز لە رێـتایە
ئەگەر سـەد شـاهی «چـین»یش بـی، کشـێکت هـاتە بـەر مـاتی[(٢)]

---

(١) تەحریك: هاندان. هەوا: ئارەزووی نەفسی.
(٢) واتە: وەك «شا» لە یاری شەترەنجدا «کش»ی لێ ئەکرێ و ئەفەوتێ، بنیادەمیش کە عیزرائیل «کش»ی لێ کرد کش و مات ئەبێ.

«ســــولەیمان» كـــوا نگـــین‌و ئـــاسەف‌و عـــیفریت‌و بـــەلْقیسی!؟
«سكـــەندەر» كـــوا شكـــۆهـ و تـــەپڵ‌و بـــەیداخ‌و مـــوهیمماتی؟(١)
بـــرا نـــاپرسی جـــارێ چـــی بـــەسەر هـــات حـــاڵی «كـــەیخوسرەو»
تـــــەمیزێكت نـــــیە تـــــا تـــــێ بگـــەی لە كـــوێیە مـــیرئاتی(٢)
ئـــەلا ئـــەی دیـــدە تـــاكـــەی نـــاگـــریت‌و نـــاگـــری عـــیبرەت
كـــــە حـــاجی شـــێخ «ئـــەمینی خـــاڵ» لە ئـــارادا نـــەما زاتـــی!
بـــە دووری خـــۆی ئـــەوا ئێمەی دوچـــاری دۆزەخـــی غـــەم كـــرد
خـــودا روتـــبەی بـــڵند كـــا رۆحـــی ئەو شـــاد بـــوو بـــە جـــەنناتی
كـــە هـــەڵگیرا جـــەنازەی، بـــوو بـــە مـــەحشەر دەشـــتی سـەر قـــەبران
لەبـــــەر گـــــریان‌و قـــــورِ پـــــێوان‌و واوەیـــــلاو عـــــەشاماتی
ئەگـــەر بشـــبم بـــە ســـەحبان، ئـــەی رەفـــێق وا چـــاكـــە بـــێ دەنگ بـــم
لەبـــەر بـــەعزێ نـــەفام نـــادووم لە كـــەشف‌و خـــەرقی عـــاداتـــی(٣)
لەوێ بـــووم حـــەزرەتی كـــاك «ئـــەحمەدی شـــێخ» بـــاس كـــرا جـــارێ
لە فـــەزڵی خـــۆی‌و «مـــەكـــتووبات»ی پـــڕ تـــەفسیرو ئـــایاتی(٤)

---

(١) نگین: ئەموستیلەكەی سولەیمان كـە ئـەڵێن هـەموو مـەرامـێكـی پـێ هاتوەتە دی. ئـاسەف: زانـایێكـی ئـیسرائیلی‌و وەزیـری سـولەیمان بـووە. عیفریت: دێوەكەی بەردەستی سولەیمان كە هەموو كارێكـی سـەختی بـۆ راپەڕاندوە.
(٢) میرئات: [مِرآت] ئاوێنە. مەبەست لە جامی جیهان نمایە.
(٣) سەحبان: سەحبانی كوڕی وائیل خۆش گۆی بە ناو بانگی عەرەب.
(٤) مەكتووبات: كتێبێكە كاك ئەحمەدی شێخ ﷺ نووسیویە.

نــــزیکی «غـــەوس»و شـــاهی «نـــەقشبەندی» کـــردووە «بِـــاللّه»
بـــەڵێ ســـەیید ئـــەبێ بـــەم نـــەوعە بـــێ هـــەر حـــوببی ساداتـــی
کـــــە مـــــیسباحی «بـــهاء الدّیـــن مـــحمّد» عـــالەم ئـــارا بـــوو
بە جەزبەی عەشقەوە عـەرشی خـودای ئـەو بـوو بـە مـیشکاتی[1]
کـــە ســـاڵی ریـــحلەتی ئـــەم مـــوڕشیدەم پرسی لە پیری عـەقڵ
بـــە حـــەرفی جـــەوهەری ئـــەم ئـــایەتەی کـــردم ئـــیشاراتـــی[2]
لە ســـوورەی «ئـــەنبیاء» تـــا ﴿صَـــالِحِینَ﴾ ئـایەی ﴿وَ أَدْخَـلْنَاهُ﴾
بـــــە تـــەئریخی وەفـــاتی مـــوشعیرە «بـــێخود» حـــورووفاتی[3]
کـــەسێ ئـــەولادی عـــەللامەی «ئـــەبووبەکـری مـوسەننیف» بـێ
کـــە عـــالەم خـــۆی ئـەکـا قـوربانی تـەحریری «وضـوحات»ی[4]

---

(١) بهاء الدّین محمّد: شێخی «بهاء الدّین» کوڕی شێخ «عثمان سراج الدّین»ی تەوێڵەﷺ. میشکات: تاقی بێ کەلێن. واتە: کاتێك کە چرای شێخی «بهاء الدّین» داگیرسا، دڵی حاجی شێخ «ئەمینی خاڵ» بوو بە تاق بۆ ئەو چرایە، چونکە حاجی شێخ ئەمین خەلیفەی شێخی «بهاء الدّین» بووە. مەبەست لە «عەرشی خوا» دڵی حاجی شێخ ئەمینە.

(٢) جەوهەری: نوختە دار.

(٣) موشعیر: ئاگادار کەر. واتە: حەرفە نوختە دارەکانی ئایەتی ﴿وَ أَدْخَلْنَاهُ فِي رَحْمَتِنَا إِنَّهُ مِنَ الصَّالِحِينَ﴾ە، کە ئەکاتە ١٣٥٠، کە ئەوەش ساڵی وەفاتی ئەو کەسەیە کە ئەم قەسیدەیە لە لاواندنەوەیدا وتراوە، کە ئەویش خوا لێ خۆش بوو حاجی شێخ «ئەمینی خاڵ»ە.

(٤) مەلا «ابوبکر مُصَنِّف»ﷺ: زانایێکی ناوداری کوردە لە ناوچەی «مەریوان»دا زانستی بڵاو کردووەتەوە، وە لە ساڵی ٩٩٤ی هیجریدا کۆچی

کـــەسێ نـــەسڵی «شـــفیع المُـــذنبین»ێ بـێ کـە بـڕژێنێ
بـــــەسەر بـــێگانەشا لافــــاوی بـــارانـــــی شـــەفاعاتی
کــــەسێ تـــەئریخی ئـــەو بـێ ئـایەتی تـەبشیری قـورئانی
بـە مـن چـۆن شـەرحـی ئـەدرێ حـاشیەی مـەتنی کـەڕامـاتی[١]
بــە حـــەققی سـیـنەیی سـاف‌و دڵـی مـەسروورو مـەحزوونی
بـــە بـێ خـــەوفی لە مـەخلووقی خـواو لە خـوا مـەخافاتی
بـــە حـــــەققی ئـــاه و نـــاڵەی رۆژو گـــریانی سـبەینانی
بـــە شـــۆری نـیوە شـەو پـاڕانـەوەو سـۆزەی مـوناجاتی
فـــەڵەك پـڕ گـریە بـێ تـا چـاوی هـەوری لێـڵ‌و تـاریکی
زەمـــین پـڕ خـــەندە بـێ تـا لێـوی غـونچەی بـاخ‌و بـاخاتی
بـــەسەر ئـــەحفادو ئـەتباعی ئـەوا بـارانـی لوتـفی خـۆت
بە خـوڕ بـڕژێنی یـا رەب، نـەك وەكـوو جـەد، بـەڵكو سـەد قـاتی

***

---

☞

دوایی کردووە. «وضوح»: یەکێکە لە نووسراوەکانی، شەرحی کتێبی «المُحَرَّر»ی ئیمامی «رافیعی»یەﷺ لە فیقهی شافیعیداو "چوار" بەرگە.

(١) تەبشیر: موژدە راگەیاندن. شەرح، حاشیە، مەتن: کتێبی کۆنی مەلایانە سێ بەشە: مەتن، شەرح، حاشیە؛ مەتن بنچینەکەیەتی. شەرحیش لێکدانەوەی ئەو بنچینەیە. حاشیەیش بە سەرا هاتنی شوێنە گرانەکانیەتی.

- ٢ -

دڵـــم بـــۆ زوڵـفـو رووی جـانانە ئـەگـری
مـــــناڵەو بـــۆ گـــوڵو رێـحانە ئـــەگـــری
چـــرا ئـــیمشەو کـــەوا فـــرمێسك ئـەڕێژێ
ئەڵێی هـەر بـۆ مـنی پـەروانـە ئـەگـری(١)
ئـــەکـــا شـــاباشی کـــێ دەریـــایی دیـدەم
کە چەشنی گەوهەری یـەك دانـە ئـەگـری؟
چیە پـیری دڵ ئـیمشەو وەك عـەرەق خـۆر
لە کـــونجی تـەکـیە بـۆ مـەیخانە ئـەگـری
شـەوێ بـێ زوڵـفی ئـەو مـەهـ پـارە تـا رۆژ
دڵـم بـۆ سینە چـاکـی شـانە ئـەگـری(٢)
غـــەزاڵـــی مـــن ئـــەگـــەر ســـاتێ نـەبینێ
بـــیابان قـــۆڕ ئـــەپێوێ، لانـــە ئـەگـری(٣)

---

(١) مەبەست لە فرمێسك دارشتنی چرا، داوەرینی دڵۆپی مۆمی تواوەیە.
(٢) سینە چاکی شانە: ئەوەی سنگی بە شانەی زوڵف لەت کراوە.
(٣) واتە: مامزەکەی من «مەبەستی لە یارە»، ئەگەر تاوێك لە بیاباندا نەبێ، بیابان قوڕی بۆ ئەپێوێ، وە ئەگەر تاوێك لە لانەکەیدا نەبێ لانە بۆی ئەگری. بێخود لێرەدا وردەکارییەکی جوانی کردووە کە مەعنای بە قوڕ بوونی بیابانی بەوە لێ داوەتەوە کە بە هۆی گریانەوەیە لەبەر دیار نەبوونی مامز. چونکە باران باری و دنیا بوو بە قوڕ مامزیش لەجێی خۆی هەڵناسێ. وە ئەو باران بارینەی بە گریانی بیابان داناوە.

کەوان ئەبرۆ، بە تێغی غەمزە تاکەی
لە جەرگم بێ گونەه نیشانە ئەگری!
لە بەزمێکا کە ساقی چاوی تۆ بێ
مەی ئەڕژێ، دڵ ئەچێ، پەیمانە ئەگری(۱)
بە یادی ئەو بەهاری روویی تۆیە
کە چاوم هەوری زستانانە ئەگری
برا تا نەبیە تۆزو گەردی بەر پێی
بە زەحمەت چاکی ئەو دامانە ئەگری
لە دڵتا گەنجی یادی کێیە «بێخود»
کە ئێمشەو نۆبەتی وێرانە ئەگری

***

- ۳ -

بە خەندەی زۆری من دێوانە ئەگری
بە گریانی کەمم فەرزانە ئەگری(۲)
بە تاریکی دەروونم گەر بزانی
هەتا رۆژ وەك چرا پەروانە ئەگری(۳)

---

(۱) پەیمانە: کاسە. مەبەست لە سەرکردنیەتی.
(۲) فەرزانە: زیرەك.
(۳) لێرەدا «ئەگری» لە «گرتن»ە، نەك لە «گریان». واتە: هەر ئەگڕایەتو پەروانەی هەزار دڵی وەك دڵی منت رائەکێشا.

لە بـێ شـیری ویسـاڵی یـارە، شـەو، دڵ
لە بـێشکەی سـینەدا تـیفلانە ئـەگـری
دوو دیـــدەی نـــێرگسینی پـڕ لە لالەم
لە دەوری لێوی ئەو چاو جوانە ئەگری(١)
لە نـەشئەی پـێکەنینی سـاقی ئـیمشەو
لە بـەزما پـیری مـن مـەستانە ئـەگـری
شتێکت دیوە ئـەی دڵ هـەر لە مـەجنوون
کە ڕێـی ئەو بێ سـەرو سـامانە ئـەگـری
وەسـیلەی گـەینە شـارت کـێیە «بـێخود»
کە چەشنی حەڵقە بەر دەرگانە ئەگـری(٢)

***

- ٤ -

پـــەرێشانم لە حـــەسرەت دەردی دووری
بە لوتـفی خـۆت بـدەی یـا ڕەب سـەبووری
چ دووری؟ دووری تـــا ڕۆژی مـــەحشەر
چ حەسرەت؟ حەسرەتێ تا نەفخی سووری

---

(١) واتە: سووری لێوی یار بە هۆی فرمێسکی خوێناوی منەوەیە، کە بۆی ئەگریم و چاوەڕوانی دووکەلیمەم لێیەوە.
(٢) واتە: بە هـیوای کـێی بگـاتە بـەرەوە، وا وەك هـەڵقـەڕێز بـەر دەرگـات گرتووە.

گــەهێ بــۆ شــاهەکــەی ئــەورەنگی تــەمکین
گەهێ بۆ مــاهەکــەی بــورجــی وەقــووری[١]
یــەکــێ «بــابا رەســوول»ی خــەڵقی «بــێدن»
یەکێ «عــبدالکــریم»ی «خــانە شــوور»ی[٢]
یەکــێ جــەننەت مــەکــانی «بــوو عــوبەیدە»
یــەکـــێ گــوڵشەن تــیرازی شــارەزووری[٣]
نەوەی پێغەمبەرێ بوون، نــەك پــەریو جــین
لە مەجلیسیا کــە جــەم کــردوویە مــووری[٤]
شـــــەهادەت نـــــامەیی عـــیرفان لە دەســـتا
موجازی مەدرەسەی دیــنیو شــوعووری[٥]
لە تـــــەقدیسا وەکـــوو شــێخی «بــریفکان»
لە تـــەدریسا مـــەلا «یــەحیا»ی مــزووری[٦]

---

(١) ئەورەنگ: تەختی پادشاهی. وەقووری: خۆ قورس گرتن.
(٢) بێدن: دێیێکە لە ناوچەی «تانجەرۆ»، لە لیوای سلێمانی، خانە شوور: دێیێکە لە ناوچەی «مایدەشت» لە کوردستانی ئێران.
(٣) بوو عوبەیدە: عەبابەیلێ، دێیێکە لە سەرووی هەڵەبجەوە.
(٤) جــەم: تــێکــرا. مــووری: مــێروولەیــی. واتــە: ئــەمانە کــە لە نــەوەی پێغەمبەرێکن کە نەك وەك حەزرەتی «سولەیمان»عليه السلام کە تەنها جنۆکە وەك مێروولە زەلیلی بەر دەستی بوون، بەڵکو تێکڕای هەموو دروست کراوێکی خوا وەك مێروولە وان لەبەر دەستیا.
(٥) یەعنی: ئیجازەی شەریعەتو تەریقەتیان بووە.
(٦) شێخی بریفکانو مەلا یەحیای مزووری: یەکەمیان شێخێکی گەورەی

لە بــێشەی عــیلمو فــەزڵو شــەرعو دنــیا
چ شــێرێ بــوون بـە ئـازایـیو جـەسووری

خــەیاتی ســەرمەدی هــەر زوو بـڕیبووی
بــە بــاڵایان کـەواو خـەرقەی غـەیووری(١)

درێــغا ڕۆیــنو مــنیان بــەجێ هــێشت
لە مــاتەم خــانەیی تــاریکی دووری

بــەهەشت ئــارا کــە بــوون «العِــزُّ لله»
لە خــۆشی خــۆشیی غـیلمانو حــووری(٢)

«بِــحمد لله» شــەوانــی غــائیبانە
موبەددەل بـوون بـە ئـەییامی حـوزووری(٣)

لەپــاش ئــەم دوو چـرای بـەزمی عـولوومە
نــەما پــەروانــە بـۆی خـۆشیو سـرووری

مــنم دائــیم ئــەکــا دوودی هــەناسەم
لە ســینەی مــەجمەرا کــاری بـوخووری(٤)

---



تەریقەتی نـەقشبەندیو دووهـەمیان مـەلایەکـی گـەورە بـووە؛ لە سـەدەی نۆزدەهەمدا لە ناوچەی «بادینان» ژیاون.

(١) سەرمەدی: هەمیشەیی. مەبەست لە خوایە.

(٢) واتە: حۆریو غیلمانی بـەهەشت بـە چـوونی ئـەو دوو زاتـە بـۆلایـان خۆشی خۆشیان پێ کەوت.

(٣) واتە: گەیشتنە خزمەتی خوا.

(٤) دوود: دووکەڵ. مەجمەر: پشکۆدان.

مــــنم وەك نـــــانەوا فـــرمێسکم ئـــاگــر
جگـــەر نـان، چـاو ئـەکـا ئیشی تـەنووری
شــــەهیدی تــــێغی ئـیخلاسی حـــەقیقی
بــــە فــــلسێ نـــایەوێ تــۆپێ بــلووری
مــــەحەبەت رێگــەیێکی راســتە قــوربان
نــەکــەی لادەی لەسـەر حـەددو سـنووری
جـــــیهان مــــادامــــەیێکی ســـینەمایە
لە بــەریا بــێ کـــەوا کـەوڵی سـەمووری[(١)]
دەخــیلت بــم نــەدا تــەفرەت وەکــوو مـن
بـە غـازەی عـاریزیو سـپیاوی سـووری[(٢)]
پــــەنا بـــــە خــوا لە بــەزمی جــادوییدا
لە ســــاقی چـــــاویو ســــاقی بــلووری
بـە چـاکـەی پـڕ خـراپـەی گـەر خـەڕۆ بـی
یـەقینت بـێ کـە سـەر تـا پـا قـوسووری[(٣)]
هـــــەزار کــــــەیخوسرەویو ئــەفراســیابی
هەزاران وەك سۆپاهی «سەلم»و «تـوور»ی[(٤)]

---

(١) واتە: وەك تیاترۆیێکی سینەما وایە کە کەوڵی سمۆری لەبەر کردبێ...
(٢) غازە: سووراو. عاریز، [عارِض]: روو. سووری: رووکەشو ساختە.
(٣) خەڕۆ: هەڵ خلەتاو.
(٤) سەلم: کوڕە گەورەی «فەرەیدوون». توور: برای «سەلم» بووە.

هـــەموو هـــاتوون‌و کـــوشتوونی لە پـــاشا
بـــە تـــۆپی نـــامورادی‌و تـــیپی زووری(١)
خـــوا ســـاڵی وەفـــاتی «کـــاکـــە بـــابا»
«مُـــنوَّر کـــەی مَـــزارســـتان بـــە نـــووری»(٢)
لە ســـاڵی فـــەوتی شـــێخ «عـــبد الکـــریم»ا
«مـــرصّع کـــە أَویش یـــا رەب قـــصووری»(٣)
زەمـــین تـــا پـــڕ لە ســـونبول بـــێ کـــەناری
فـــەلەك تـــا پـــڕ لە ئـــەنجوم بـــێ جـــحووری(٤)
ئـــــەوی مـــــاون بـــــیانهێڵی ئـــــیلاهی
بـــە جـــاهی خـــۆت کـــەوا «حَـــیّ»و غـــەفووری
خســـــووس «دزیـــایش»و دانـــــای «پـــریسی»
لەگەڵ ســاداتـــی تـــەکـــیەو هـــانە سـووری(٥)

(١) زوور: ساختە.
(٢) نیوەی شیعری دووهەم لەسەر شێوەی نووسینی کۆنی کوردی، بە حیسابی ئەبجەد، ساڵی کۆچی دوایی شێخ «بابا رەسوول»ە کە ئەکاتە ١٣٦٣ی هیجری.
(٣) نیوەی شیعری دووهەم لەسەر شێوەی نووسینی کۆنی کوردی بە حیسابی ئەبجەد ساڵی کۆچی دوایی شێخ «عبد الکریم»ە کە ئەکاتە ١٣٦١ی هیجری.
(٤) کەناری: قەراغەکانی. جوحووری، [جُحر]: کون‌و کەلەبەری.
(٥) واتە: مامۆستا مەلا «قادری سۆفی»و مامۆستا مەلا «عەزیزی پریس»و مامۆستا شێخ «رەسوولی هەڵەبجە»و سەییدی «هانە سوورە». «خوا لێیان خۆش بێ».

کــە «بــێخود» تــۆزی داوێــنی ئـەوان بـێ
ئــــەشێ یـــا ڕەب لە تــەقسیری بــبووری

***

- ٥ -

وەك «بێدڵ» ئەڵێ: حـەیفە کـەوا ساکـنی بـاغی
بـوڵبوڵ لە دڵت دەرئـەکـەی‌و تـێکەڵی زاغـی(١)
بۆ شێخ «عومەر»، ئەو سەروی ڕیازاتی عـولوومە
وا لافت ئــەدا تـۆ کـە وەکـوو لالە بـە داغـی(٢)
لەوساوە کە جێی جەننەتە ئـەو زاتـە، کـەچی تـۆ
لەم ئاگـرەدا عـەینی سـەمەندەر بـە دەمـاغی(٣)

---

(١) بێدڵ [بیدل دهلوی] ئەڵێ:
حیف است دو روزی که مُقیم بـاغی
بــیگانه ز بـلبلی و حــریف زاغــی
صحبت این‌جا مؤثّر است آگه بـاش
در آب زوی‌تــری، در آتش داغــی
زاغ: قەلە ڕەش.
(٢) ریازات، «ریاضات»: باخچەکان. وەکـوو لالە بـە داغـی: واتـە: وەکـوو گوڵی لالە سوور بوویتەوە.
(٣) سەمەندەر: دەعباییکە ئەڵێن ئاگر کاری تێ ناکا.

«بێخود» غەمی ئەو عالەمی باڵایە نەکەی فاش
با هەر لە دەروونا بێ ئەگەر راستی‌و ساغی[١]
لەو باغە ئەگەر ساڵی وەفاتی ئەو ئەپرسی
«گـڵ» لابەرە، ئەثریخیە «ابـن القـرداغـی»[٢]

***

- ٦ -

دیسان لافاوی غەم هات هەر وەکوو بارانی نیسانی
بیناغەی قەسری مەعمووری تەرەب رووی کردە وێرانی
دیسان شاهی قەزا یەخسیری فەرموو جەیشی جەمعییەت
کە سەوقی کردە سەر ئیقلیمی دڵ هۆردووی پەرێشانی[٣]
لەناو فرنی دەروونا وەك سەموون بۆچی نەبرژێ دڵ
لە کوورەی سینەدا تاکەی نەبێ جەرگیش بە بوریانی
کەوا مەخدوومەیێکی نەو نیهالی کاکە «شێخ عوسمان»
لە باخی عومری خۆی نەی خواردبوو هێشتا بەری جوانی[٤]

---

(١) فاش: ئاشکرا.
(٢) واتە: مەجمووعی (ابنُ‌القَرَداغی) لەفزی (گڵ=گوڵ)ی لێ لابە کە بە حیسابی ئەبجەد ئەکاتە "٥٠" ١٣٥٤ی ئەمێنێتەوە. ئەم پارچەیە لە لاواندنەوەی خوا لێ خۆش بوو شێخ «عومەر»ی مامۆستای خانەقای مەولانای سلێمانیدا وتراوە کە ناوبانگی «ابنُ‌القَرَداغی» بووە.
(٣) یەخسیر: دیل. واتە: پێشان «خاتر جەمع» بووین‌و پەرێشانی کردین.
(٤) نەو نیهال: تازە نێژراو، نەمامی نوێ.

زەمین نەیدیبوو سەروی موعتەدیل وەك قەددی مەوزوونی
زەمان نەیبیستبوو خونچەی گوڵێ وەك لێوی خەندانی
وەکوو تەیرێ کە بەر بووبێ لە حەڵقەی داوی سەییادێ
فڕی رۆحی رەوانی بۆ ریازی خولدی رۆحانی(١)
ئەلا ئەی قاسیدی ئەسرین کە چووی بۆ زیارەتی قەبری
بڵێ نەوباوەیێکی نەقشبەندی بوو بە میوانی(٢)
«بەدیعە»ی جەننەت ئارا گەر نەما، ئەمما بە لوتفی خۆت
بدەی یا رەب دەوامی عومری جەددو باوكو خزمانی
چ جەد؟ ئاودێری باخی حیکمەتو دینی موبینی حەق
چەمەن پیرایی عیلمو باخەوانی شەرعی یەزدانی(٣)
سەحابی گوڵشەن ئارایی حەدیسی ئەحمەدی موڕسەل
بەهاری نەشئە بەخشی خونچەیی ئایاتی فورقانی(٤)
چ باوك؟ یادگاری حەزرەتی شێخی «سراج الدّین»
نەوەی نائیب، وەلی عەهدی «علاء الدّین»ی عوسمانی
لە تەکیەو خانەقای زوهدا ئیلاهی کامگاری کەی
بە جاهی شاهو بازی نەقشبەندو غەوسی گەیلانی(٥)

---

(١) [ریاز، ریاض: باخ].
(٢) ئەسرین: فرمێسك. نەو باوە: تووڵی تازە هەڵچوو. بوو بە میوانی: میوانی قەبرەکە. (٣) چەمەن پیرا: رازێنەرەوەی گوڵزار.
(٤) سەحاب: هەور. فورقان: [ناوێکە لە ناوەکانی] قورئان.
(٥) باز: باز الله لەقەبی شێخ «عبد القادر»ی گەیلانییە.

لە تـەئریخی وەفـاتی ئـەو بـەدیعەی نـەوجوان عـومرە
ئـەپرسن گـەر لە پـیری عـەقڵی دانـا قـاسیو دانـی[(١)]

لە بەیتی ئاخری نیو شیعری سانی، حـەرفی بـێ نـوختەی
ئـەکـا ئـیزهاری سـاڵی ریـحلەتی مـەرحـوومەیی فـانی

ئیتر «بێخود» ئەڵێ «وا حەسرەتا» زوو گوڵشەنی چۆڵ کـرد
«بَـدیعهٔ رۆزگـارُ عَـرعَرِ جـۆبارِ عُـثمانی»[(٢)]

***

- ٧ -

لە دوڵـبەر گـوفتوگۆیێکم نـەبیست، ئـەی سینە ئـەفغانێ
لە لێـوی پـێکەنینێکم نـەدی، ئـەی دیـدە گـریانێ[(٣)]

دەسـم نـاگـاتە شـووشەی گـەردنی مـینایی، ئـەی سـاقی
دەمـم نـاگـاتە چـاوی، ئـەی عـەرەق خـۆرینە فـنجانێ

---

(١) قاسی: دوور. دانی: نزیك.

(٢) ئەم پارچەیە لە لاواندنەوەی «بەدیعە»ی کچی شێخ عوسمانی بیارەدا وتراوە کە لە ١٣٦٤ی هیجریدا کۆچی دوایی کردووە، ساڵی مردنی بە حرووفی ئەبجەد ئەکاتە «بدیعهٔ رۆزگارُ عَرعَرِ جۆبارِ عثمانی -بەدیعەی رۆژگارو عەرعەری جۆباری عوسمانی».

(٣) ئەفغان: فوغان، هاوارو گریان. ئەم پارچە لەسەر ئاوازی غـەزەلەکـەی «یغما»یە کە ئەمە[ی خوارەوە] سەرەتاکەیەتی:
«بجانان درد دل ناگفته ماند، ای نُطق تقریری»
وە پێش بێخود کەس لە کوردیدا نەی وتووە، وەکوو خۆی ئەفەرمێ.

پەرێشانم، لە رووی ئەو شۆخە لاچۆ ساتێ ئەی پەرچەم
دڵم بەینێکە زۆر تاریکە ئەی شەو ماهی تابانێ
گەهێ زامداری تێغی نازو غەمزەم، چارێ ئەی جەڕڕاح
گەهێ بیماری چاوم، ئەی رەئیسی سیحجە دەرمانێ(١)
بە شەو شێواوی زوڵفی عەنبەرم، ئیمدادێ ئەی سونبوڵ
بە رۆژ چەوتاوی باڵای دوڵبەرم ئەی سەرو جەولانێ(٢)
لە شەوقی ماهی رووی ئەو شۆخە تۆخوا پڕتەوێ ئەی رۆژ
بە یادی چاکی سینەی، ئەی سەحەر سا دەی گریبانێ(٣)
بەتاو هات لەشکری غەم، سا لە خۆ رۆیشتنێ ئەی دڵ
منالی زۆرە شاری سینە، ئەی مەجنوون بیابانێ(٤)
زەلیلم، بگرە دەستم کەوتووم، سا رەحمێ ئەی گەردوون
فەقیرم، نامورادم، بێ نەوام، ئەی مونعیم ئیحسانێ
وەکوو «بێخود» لەمەولا بگرە بۆ خۆت رێگەیێ ئەی پێ
لە مەولای خۆت بووێ تۆش چەشنی ئەو ئەی دەست دامانێ

***

---

(١) گەهێ: تاوێك.
(٢) ئیمداد: یارمەتی. چەوتاو: چەماوە. جەولان: لەرینەوە.
(٣) گریبان: یەخە. واتە: یەخەی شوبهاندوە بە بەرەبەیان.
(٤) لە خۆ رۆیشتن: لە هۆشی خۆ چوون. منالی زۆرە...تاد: واتە: بۆ ئەوەکە منالەکانی سینەم تیا رابوێرن. مەبەست لە داواکردن لە «مەجنوون» ئەوەیە کە ئەو هەمیشە بە بیابانەوە بووە لەتاو دەردی عیشق.

- ٨ -

سـەبا دوێـنێ لە وەخـتی نـیوەڕۆدا قـاقەزی هـانی
لە پشـتی زەرفـەکـەی نـووسرابـوو: بـۆ بـێخود، سـلێمانی
کە زەرفم کردەوە چاوم بە ئیمزای سـەروی «نـووری» کـەوت
وەکوو بولبوڵ خەیاڵـم کەوتە سەر ئەوجی غـەزەڵ خـوانـی(١)
لەپاش حەمدو سەناو شوکرو سوپاسی حـەزرەتی بـێچوون
لەپـاش سـەڵوات‌و تـەسلیمی شـەفیعی ئـوممەتی جـانی(٢)
وتم: ئەی خەتت‌و خامەت میل‌و سورمەی چاوی مەهجووران
وتـم: ئـەی بـۆیی نـامەت بـۆیی جـامەی مـاهی کـەنعانی(٣)
گـەلێ ئـەبیاتی تـازەت نـاردبوو بـۆ مـن کـە بـیبینم
لە ئـەووەڵ مـەتڵەعا مـەزمونی ئـاخر مـەقتەعم زانـی(٤)
لە لەفزا شیعرەکانت گـەر تـەواو بـوون وەك قـەدی مـەوزوون
لە مـەعنادا بـەڵام وەك کـردەوەی خـۆت بـوون بـە نـوقسانی

---

(١) نووری: عەقیدەی «نووری مەلا مارف»، خوشکەزای «بێخود».
(٢) جانی: تاوانبار.
(٣) مەهجووری: تەریك کەوتوو. بۆ: بۆن. جامە: کراس. مـاهی کـەنعانی: مەبەست لە حەزرەتی «یۆسف»ە کە کراسەکەی نارد بۆ باوکی بـیهێنـێ بـە چاویا تا چاك ببێتەوە.
(٤) مەتڵەع: سەرەتای شیعر. مەقتەع: بڕکەی شیعر.

لەبـاتی شـیعرو مـیعری فـارسیو کـوردی ئـەبێ جـارێ

خـەریکی دەرزو دەورت بـی کـە مـنداڵـی دەبـوستانی (١)

دەخیلت بم لە حوسنی خولقو سەعیا قـەت نـەکـەی سستی

کە سـەعیو حـوسنی خـولقی خـەڵقە ئـەمڕۆ بـاعیسی نـانی

لە کـولبەی دیـدەما گـەر مـەیلی ڕەقـاسەت نـەما، نـووری

لە جـەرگەی سـینەما گـەر سینەما بـاسی نـەما، جـانی (٢)

خودا ناکەردە پەندی مـن ئـەگـەر وەك دوڕ لە گـوێ نـەگـری

هـەتا ڕۆژی قـیامەت هـەر پـەشیمانو پـەشیمانی

ئـەگـەر ژانـی وەهـا نـەبوایـە «ڕۆمـاتیزم»ەکـەی قـاچم

ئـەهاتم حـەفتەیێ بـۆ زیـارەتی بـەغدا بـە مـیوانـی

ڕووەو بـەیتی خـودا خـاڵت ئـەڵێ دائـیم لەسـەر بـەرماڵ

لە وەخـتی پـاشو پـێشی نـوێژی ئـێوارەو سـبەینانی

خوداوەندا بـە جـاهی خـۆشەویستی خـۆت بـەدووری کـەی

لە ئـاسیبو بـەڵا، ئـەم خـوشکەزایـەم، خـۆیو خـزمانی (٣)

***

---

(١) دەبوستان: قوتابخانە[ی سەرەتایی].

(٢) کولبە: کەلاوە. نووری: نووری چاو، ئیشارەتە بە ناوی «نووری». جانی: گیانیت. واتە: کاتێك بە نووری چاوی خۆمت دائـەنێمو لە دڵما جـێگـەت ئەکەمەوە کە بیر لە سینەماو تیاترۆخانە نەکەیتەوە. مەبەستی لەوەیە کە هەر خەریکی خوێندن بێ.

(٣) ئاسیب: زیان.

- ٩ -

لە بورجی سینە کە ئەو زوهرە چاوە پێ ئەکەنێ
فریشتەیێکە لە عەرشی خوداوە پێ ئەکەنێ(١)

کە لێوی گوڵ بە هەناسەم ئەگا، ئەڵێی ئاخۆ...
چ خونچەیێکە بە دەم بای سەباوە پێ ئەکەنێ!؟

لە خۆشی ئەو دەمە زۆری نەماوە باڵ بگرم
رەقیب کە ئەگری‌و ئەو شۆخی لاوە پێ ئەکەنێ

هەزار بولبوڵ ئەکا مەست‌و ئەیشیگریێنێ
لە گوڵشەنێ کە ئەو ئارەق گوڵاوە پێ ئەکەنێ

ئەسیری شێری دڵی ئەو کەسەم لە خۆشیانا
کە کەوتە سیلسیلەی ئەو زوڵفە خاوە پێ ئەکەنێ

بەدی ئەکا کە سەحەر موویی رۆژو روویی شەوم
ئەڵێی بە من لە کەناری سەماوە پێ ئەکەنێ(٢)

ئەزانی «بێخود» ئەگەر چۆنە بەم هەموو غەمەوە
بە دەم بروسکەیی «عَرَقُ النِّساء»وە پێ ئەکەنێ

---

(١) بورجی سینە: دڵ. بۆیە لە بورجی سینەدا: چونکە خۆشەویستەو خۆشەویستیش جێگای لە دڵدایە. عەرشی خودا: مەبەست دڵە. وەك وتراوە «قَلْبُ الْمُؤْمِنِ عَرْشُ الرَّحْمٰنِ» واتە: دڵی موسوڵمان بارەگای خوایە.

(٢) موویی رۆژ: مووی سپی بوو وەك رۆژی رۆشن. مەبەست لە پیری‌و عومری درێژە. روویی شەوم: رووی وەك شەو رەشم مەبەست لە گوناهبارییە. سەما: ئاسمان.

- ١٠ -

ئـــاخ له دەس دنـــیایی دوونو بـــێ وەفـــا
داد لەدەس گەردوونو چەرخی کـەچڕەوی
رەبـــبی ئــەی دنــیا دەوامت قــەت نـەبێ
ئـەی فـەڵەك تـۆش تـا قـیامەت نـەسرەوی
وەك گـڕت بـەردایـه عـالەم هـەر وەکـوو...
قــــونبولەی زەڕڕی لەســــەردا بــۆ زەوی
خادیمێکی جان فـیداو مـیللەت پـەرەست
داهــییەکــی گــۆشه گــیرو مــونزەوی(١)
فــەیلەسووفێکی ئــەدیبی قــەومی کــورد
عــالمێکی بــەرزی مــاددیو مــەعنەوی
خـــاوەنی «ژیـــن»و «قسـەی پـێشینیان»
سـاحێبی ئـینشا و «رۆحـی مـەولەوی»(٢)
بـــاخەوانـــی چـــارباخی پـیری «تـووس»
گەنجەوانی پـەنج گـەنجی «گـەنجەوی»(٣)

---

(١) داهییەکی: داهیەیەکی؛ داهیە: باڵا، مـەبەست له وریـاییو زیـرەکییه. مونزەوی: گۆشەگیر.

(٢) ناوەکانی نـاو دوو کـەوانـەکـان هـەندێکـن له بـەرهەمه ئـەدەبیەکـانی «پیرەمێرد» که ئەم قەسیدەیه بەبۆنەی مردنیەوە وتراوە.

(٣) پـیری تـووس: فـیردەوسی خـاوەنی «شـاهنامه». گـەنجەوی: نـیزامـی خاوەنی «خەمسە».

بــــولبولی گــولزاری «تــەبریزی» لەقــەب
قــومریی ســەروی ریـازی «مـەسنەوی»(١)
مـوحییی مـەعنایی مـردووی نـەزم‌و نـەسر
هــەروەکــوو ئـەنفاسی پـاکـی عـیسەوی
وەك «حـــەمەد پـاشا»، بـەڵام بـێ شـێرەوان
کـــردبووی شـێری وەفـــا رام‌و کـەوی(٢)
مـــــەجلیس ئــارایــی ئـــەدیبانی زەمـــان
پـیری دنـــیایی‌و جـــەوانــی ئــوخرەوی
«حاجی تەوفێق» دەستی «شێرۆیە»ی ئەجەل
رۆحـــی شـــیرینی دەرێــنا خـوسرەوی(٣)
سەد کە ئیمڕۆ پێ لەسـەر شـانۆی سـەمای
تۆش سەری بەرزت ئەبێ سـوبحەی نـەوی
رۆژی روونـــاکـت مـــەگـــەر ئـاوا بـــووە
بــۆیە «بـێخود» تـیرە دڵ چـەشنی شـەوی
تۆش ئـەگـەیتە ئـەوجی مـەحبووبی خـودا
گـــەر بــە مـیعراجـی سـەخادا سـەرکەوی

---

(١) تەبریزی: شەمسی تەبریزی. مەسنەوی: دانراوە شیعرییەکەی «جەلال الدّین»ی رۆمی. (٢) کەوی: دەسەمۆ.
(٣) شێرۆیە: کورەکەی خوسرەو پەروێز کە باوکی خۆی کوشت بۆ ئەوەی «شیرین» داگیر بکا بۆ خۆی.

کــــاکـــــه «اَلنّــاسُ نِــیٰامٌ» پــێت ئــەڵێ
ئەو کـەوا بـیدارە، تـۆ مـەستی خـەوی..(١)

***

- ١١ -

وەرن بـــــــەزمێکی مـــــەشرووعانە بگـــــرین
بە کوێری چاوی «پەروێز»و «جەم»و «کـەی»(٢)
نـــــەوەك نـــــەقشی، تـــەریقەی مـــەولەوی وار
بـــە زیکـــری جـــەهری‌و دەنگـــی دەف‌و نـەی(٣)
بـــــە دەوری نـــووری دڵـــدا حـــەڵقە بـــەستین
مەسەل ئەو مانگ‌و ئێمەش چەشنی «هـالە»ی(٤)
بــفەرموون ئــەی قــەدەح نــۆشان بــە ساقی
لە کـــووپەی مـــەعریفەت تـــێکا ئـــەویش مـەی

---

(١) «اَلنّٰاسُ نِیٰامٌ»: عالم نووستوون. واتە: ئاگایان لە مردن‌و پاشە ڕۆژ نیە.
(٢) پـــەروێز: خـــوسرەو پـــەروێز. جـــەم: جـەمشید. کـەی: کـەیکاوس یـا کەیخوسرەو، کە ئەمانە هەموو لە شاهانی کۆنی ئێران بوون.
(٣) مـــەولەوی‌وار: لەســـەر شـێوەی تـــەریقەتی مـــەولەوی. هـەوادارانـی تەریقەتی نەقشبەندی بەبێ دەنگ یادی خوا ئەکەنەوە. بەڵام مەولەوییەکان بە دەف‌و ئاهەنگەوە یادی ئەکەنەوە.
(٤) هالە: خەرمانەی دەوری مانگ.

دەری بــــێنین بـــە زۆری نـــوێڵی شـــادی

درەخـــتی غــەم لە بــنچینەو رەگو پــەی(١)

خـــودا، ســـا بــۆ دڵــی تــاریکی ئــیسلام

لە تــیشکی لوتــف ئیتر یــەك زەڕڕە دەرخـەی

بـــە چـــاوی ســـەر هــەتا عـــالەم بــبینین

لە «مەشریق» تا بە «مەغریب»، «ڕۆم» هەتا «ڕەی»

کــە یــاران مــەستی بــادەی «لَمْ یَزَلْ» بــوون

دەســا «بـێخود» غـوڵامت بـم ئـەتۆش دەی(٢)

بــــڵێ ســـاڵی لە دایك بــــوونی «تــەوفێق»

نكنوڕی «ئـەحمەد» کـە یەعنی نــووری دیـدەی

لە شـــیعری ئــاخری نــیو شــیعری دوایــی

ئـەگـەر دیـققەت بـفەرمووی پـێی ئـەبەی پـەی

لە دنـــــیا و لە عـــــوقبادا ئـــیلاهی

«بــە صــاحب مــالُ جــاهُ ثــروتی کــەی»(٣)

***

---

(١) نوێڵ: ئاسنی بەرد هەڵکەندن.

(٢) «لَمْ یَزَلْ»: نەفەوتاو، [نەبڕاوە]. مەبەست لە خوایە.

(٣) نەمانزانی ئەم پارچە شیعرە بەبۆنەی لەدایك بوونی کام «تەوفێق ئەحمەد»ەوە وتراوە کە لە ساڵی ١٣٣٩ی هیجریدا هاتوەتە دنیاوەو ساڵی لە دایك بوونەکەی بە حیسابی ئەبجەد، ئەکاتە «بە صاحب مالُ جاهُ ثروتی کەی ـ بە ساحێب ماڵو جاهو سەروەتی کەی».

- ١٢ -

ئیلاهی ئەم گوڵی نەورەستە هەر دائیم بەهاری کەی
لە باخی پڕ لە مێوەی توولی عومرا کامگاری کەی[١]
پەری تەقوا و عیفریتی هەواو نەفسی موسەخخەر بن
لەسەر تەختی سولەیمانی بڵەندو پایە داری کەی
لە ئەوجی مەیمەنەتدا وەك هومایونی موبارەك بێ
لە بورجی مەعریفەتدا هەروەکوو ڕۆژ ئاشکاری کەی
ئەوی ئەم نەونەمامی جۆیی عیرفانەی نەوێ یارەب
لە ڕووی چاكو خراپا هەر تەریقو شەرمەزاری کەی[٢]
بە تەئریخی لە دایك بوونی ئەو دائیم ئەڵێ «بێخود»:
«خدا وك بابُ باپیری وحیدِ ڕۆزگاری کی»[٣]

***

(١) نەورەستە: تازە پەیدا بوو. کامگار: بە موراد گەیشتوو.
(٢) جۆ: جۆگە.
(٣) ئەم پارچە هەڵبەستە بەبۆنەی لە دایك بوونی «محەممەد جمال الدّین»ی کوڕی مەلا «محەممەد سەعید»ی حاجی مەلا «ئەحمەد ئەفەندی» دێلێژەییەوە وتراوە. کە لە ساڵی ١٣٦٣ی هیجریدا هاتووەتە دنیاوە، وە ساڵی لە دایك بوونی بە حرووفی ئەبجەد ئەکاتە «خدا وك بابُ باپیری وحید ڕۆزگاری کی ـ خودا وەك باب و باپیری وەحیدی ڕۆزگاری کەی».

- ١٣ -

دیسان هەوری بەڵا هات، سایەقەی وەسڵی گوڵان ڕۆیی
شەوی ماتەم پەیا بوو، ڕۆژی خۆشی بولبولان ڕۆیی
تەمی غەم تا قیامەت بۆچی دانەگرێ وڵاتی کورد
کە زاتێکی وەفادارو نەجیبو خانەدان ڕۆیی
بچووك بۆ قوڕ نەپێوێ؟، گەورە توخوا بۆ بە کوڵ نەگری؟
کە عاسای دەستی پیرو هێزی ئەژنۆی گەنجەکان ڕۆیی
سەدای باوكو برا ڕۆی خەڵقو گرمەی سینە، ناڵەی دڵ
وەکوو ڕەعدی بەهار ئیمڕۆ زەمین تا ئاسمان ڕۆیی
مشوور خۆری گەلی میللەت جەنابی «مُصطفیٰ مظهر»
کە بانگی حوسنی خوڵقی بۆ هەموو کوردووستان ڕۆیی
مەگەر «کاکینە» هاوتای ئەو بکا، ناویان لەیەك دوور بێ
وەگەرنێ چەشنی ئەو چەشنی حیکایەو داستان ڕۆیی(١)
لەسەر وەتراخی دەشتی ڕۆحو شاخو داخی بەرزی دڵ
هومای ئەوجی سەعادەت، بازی عیرفان ئاشیان ڕۆیی(٢)
بە غایب بوونی ئەو باوکی فەقیرو خادیمی قەومە
لەسەر هۆشو لە دڵ سەبرو لە تەن تابو تەوان ڕۆیی

---

(١) کاکینە: مەبەست لە «جَميل صائِب»ە. واتە: مەگەر جەمیل سائیب جێگای خوا لێ خۆش بوو بگرێتەوە، ئەگینا مەگەر بە سەرگوزەشتە بیگێڕنەوە کە پیاوێکی وا بووە. (٢) وەتراخ: ڕایەخ. ئاشیان: هێلانە.

ئەگەرچی میللەتی کوردی دوچاری دۆزەخی غەم کرد
بەڵام شوکری خوا خۆی بۆ بەهەشتی جاویدان رۆیی
موحاسیب موهمەلی ئەم شیعرە گەر جەمع و جیبایەت کا
ئەزانێ کەی رەوانی پاکی بۆ باخی جینان رۆیی(١)
«وەتەن «بێخود» وەکوو ئەولادەکانی بۆچ نەناڵێنێ
«مدیری دائیرەی بەرزی معارِف زی نشان رۆیی»(٢)

***

---

(١) موهمەل: حەرفی بێ نوختە. جیبایەت: کۆکردنەوە. رەوان: گیان.
(٢) ئەم پارچەیە لە لاواندنەوەی بەڕێوەبەری مەعاریفی سلێمانی «مصطفیٰ مظهر»دا وتراوە کە لە ساڵی ١٣٦٥ی هیجریدا کۆچی دوایی کردووە. وە ساڵی مردنی بە حیسابی ئەبجەد ئەکاتە حەرفە بێ نوختەکانی دوا شیعری ئەم پارچەیە، بەو شێوە شێوە نووسینەی کە پێی نووسراوەتەوە، لەسەر ئەوەکە «ی»کانی هەموو بە بێ «نوختە» دابنرێن و یەك «ی» بۆ «رۆیی» دابنرێ.

# پارچە

## یانەی سەرکەوتن

«یانەی سەرکەوتن» کە «نادی» ناوە
لە شاری «بەغدا» بینا کراوە

بانی ئەم یانەش «مەعرووف جیاوک»ە
کە بۆ قەومی خۆی «اَلحَق» باوکە[١]

لە ساحەی سەعیا ئازاو دەس و برد
«مُشار اِلیە» گۆی سەبقەتی برد

رەئیس و روکنی ئەم یانە بەرزە
چونکە هۆ ناکەن لە شێری شێرزە[٢]

ئەگەر ئەویانەو ئەگەر ئەمیانە
خوا سەربەرزیان کا ئەعزای ئەم یانە

لەگەڵ سکرتێر کە «ئەورەحمان»ە
ئەو ئەورەحمانەی کە نووری جانە[٣]

وەتەن پەرستەو خادیمی کوردە
لە هەموو عیلما شارەزاو وردە

---

(١) مەعرووف جیاوك: یەکێك بووە لە سیاسەتمەدارانی کوردی عێراق.
(٢) هۆ ناکەن: سڵ ناکەنەوە. شێرزە: شێرزاد، بەچکە شێر.
(٣) ئەورەحمان: «عبد الرّحمان نوورجان»، رۆشنبیرێکی کوردە.

گـەر ئـەو تـەئریخەش نـازانـی چـیە!؟...
سـالّی مـیلادی نـۆسەدو سـییە
غـایەی نـادیمان بـۆ ئـەم کـوردانـە
بـڵاو کـردنەوەی عـیلمو عـیرفانە
وەك ئەخلاق، ئەدەب، تەئریخ، جوغرافـی
لەگـەڵ یـەکـیەتی بـە دڵـێکی سـافی
وەکـوو بـە کـوردی دانـانی لوغـات
وەك تەشجیع کردن لەسـەر مـەسنووعات
بـۆ کـتێب دانـان لەگـەڵ تـەرجـەمە
هـەرچـەند تـێکۆشین هـێشتا هـەر کـەمە
لە مـوساعەدەی تـەلەبەی فـەقیر
تکـامان وایـە هـیچ نـەکـەین تـەقسیر
قـوتابی زیـرەك بـنێرین ئـاوا
بـۆ وڵاتـی دوور یـانێ رۆژ ئـاوا
ئـەمجا یـارمەتیو ژیـنی ئـەم یـانە
لە مـیللەتی کـورد زۆر هـیوامـانە
چـونکە پـێویستە بکـرێ سـەرفی مـاڵ
چ بـۆ ئـیستیقباڵ، چ بـۆ ئـیستیقلال
ئـیتر هـەر بـژی لاوانـی وەتـەن
یـانێ ئـاوا بـێ بـاوانـی وەتـەن!

***

## لاواندنەوەی مەلا محەممەدی بزەینیان

مــەلا «مــحەممەد»ی نــەژاد بــاخانی
کــە پــێشەوا بــوو بۆ «بـزەینیانی»[1]
بــەهەشت ئــارا بــوو لە پڕ تــەشریفی
ئــەوەندە بــاش بــوو نــاکــرێ تــەعریفی
یــەزدان کــە رۆژی عــومری ئــاوا کــرد
یــاران تــەئریخیان هــەموو داوا کــرد
دەس‌بەجێ «بێـخود» وەك دانای تووسی
ئەم نیوە شیعرەی بـە تـەئریخ نـووسی...
عــــامی وەفــــاتی مــەلای بــاخانی
«عــــامی وەفــاتی مــەلای بــاخانی»

***

---

(١) ئەم پارچە هەڵبەستە بەبۆنەی کۆچی دوایی مەلا «محەممەد باخانی» ئیمامی دێی بزەینیانەوە وتراوە کە لە ساڵی ١٣٧٣ی هیجریدا کۆچی دوایی کردووە.

# دلاوەران[1]

منالەکان:

ئەولادی وەتەن، ئێمە کەوا میللەتی کوردین
بۆ غایەیی ئاسایشی میللەت هەموو گوردین
شێرانە ئەوا مەعرەکە ئارایی وەغا بووین
بۆ رشتنی خوێناوی عەدوو حازری را بووین[2]

---

(١) کاک «موستەفا سائیب» لەبارەی ئەم سروودەوە بۆ کاک «عبدالرّحمان موفتی» نووسیوە ئەڵێ: ساڵی ١٩٢٢ لە «کەرکووك» قوتابی بووین، بەیانیان بە تورکی گۆرانییان پێ ئەوتین، بیستم کە جەنابی مامۆستا «بێخود» تەشریفی هاتووە بۆ «کەرکووك»؛ چوومە خزمەتی لە بەر «تەکیە»و لە دوای بەخێر هاتن عەرزم کرد: لێرە بە تورکی گۆرانیمان پێ ئەڵێن، ئەویش فەرمووی: جا موستەفا چیت ئەوێ!؟ وتم: قوربان سروودێکمان بە کوردی بۆ دابنێ هەتا ئێمەش لەبەری بکەین، فەرمووی: باشە بەیانی وەرەوە تا سروودەکە بەری. بەیانی چوومەوە خزمەتی ئەم سروودەی فەرمووبوو خوێندیەوە بۆم، منیش رەوانم کردو بردم بۆ قوتابخانەو بە قوتابییە کوردەکانم رەوان کرد؛ خۆیشی نوسخەیەکی نارد بۆ «سلێمانی» بۆ «شێخ نووری»ی «شێخ ساڵح» کە لە رۆژنامەکانا بڵاوی بکاتەوە. ئەنجا قوتابخانەکان هەموو بردیانو قوتابییەکان لەبەریان کرد، سروودەکە کە لە سلێمانی بڵاوکرایەوە ناوی شێخ نوورییان لەسەر دانابوو وە لە کتێبی «گۆرانی کوردی»دا بە ئیمزای «م. نووری» بڵاوکراوەتەوە.

ئەم سروودە لەسەر ئاوازی: «دیشب کە مرا وضع وطن در نظر آمد» ئەوترێ.

(٢) وەغا: جەنگ. را: رێ، رێگە.

***

له پـــــێشمانەوه هـــەروا بـەیداخـــی زەفـەر ئـەڕوا
ریشەی عەدوو با دەر بـێنین حەق بەدەس خۆمان بسێنین

***

بۆ نەمانی مەزالیم، سوارانی جـەنگی
تەپڵی بازیان لێدا بە شـۆخ و شـەنگی

***

باوك:

لەم وەزعە گەر ئەی دوژمنی کورد ئێوه ئەپرسن
ئـــەم هـــەمهەمەیە مـیللەتە هـەڵساوه، بـترسن

***

کــــفن بــۆ خــۆتان بـبڕن هــــەر له ئـێستاوه بـمرن
لازمە لەبەر غەم و حەسرەت بین ئەشك ڕێزی مـەزەللەت

***

ئــــەی دلاوەرانـــی وەتــەن وەرنــە ئـیمداد
بــاوك بــە پـەرۆش، لێتان ئـەکـا ئـیستیمداد

کوردانی «غَضَنفَر» شکەنی مەعرەکە ئاغۆش

نابێ بکەن ئەم باوکی خۆتانە فەرامۆش[(١)]

زێرا کە دوو چاوی ئەبەدی ئێمە لە گۆڕا

چاوی لە زەفەرتانە لە حەربو شەڕو شۆڕا[(٢)]

***

باوك بە قوربانتان بێ    رۆحەکەی فیداتان بێ

وەختی فرسەتو ئیتیفاقە    رۆژی لابردنی نیفاقە

***

ئارەزوو ئەکەم ئێوە، وەختی ئیحتیزار

بە شانو زەفەرەوە بمبەن بۆ مەزار[(٣)]

***

دایك:

بۆ دەفعی مەزالیم، لە مەوانیع مەکە پەرهێز

سا دەس بەرە شێرو تفەنگو خەنجەری خوونڕێز

بۆ ئێوە کەوا غیرەتە یەك دەفعە رەگو ئێسك

حاشا کە بە حوزنێکی زەلیلانەوە فرمێسك

***

---

(١) «غَضَنفَر» شکەن: شێر بەزێن. مەعرەکە ئاغۆش: ئەوەی ئەوەندە ئازایە ئەڵێی جەنگی لە باوەش گرتووە.    (٢) زێرا: چونکە.

(٣) ئیحتیزار: گیان دەرچوون.

له چـــاوم بـــێتو بـتكێ دڵــم یــەك زەڕڕە بشكــێ
چونكو ئێوه جەسوور ئەبینم نـــامێنێ ئـازاری بـرینم
شیرەكەم حەڵاڵتان بێ، رۆژی هیممەته
رۆحەكەم فیداتان بێ، وەختی غـیرەته

***

منالەكان:

نوخبەی ئەهلی ئێمه هەموو بەم دەس‌و برده
خەڵقینه لەبۆ مـەسعەدەتی مـیللەتی كـورده
مـەوتێ كـه حـەیاتی وەتـەنێكی له دوا بـێ
سەد ژینی زەلیلانەیی یـاڕەب بـه فـیدا بـێ

***

ئــەوكەسانەی جــەبانن مــەعنای ژیـان نـازانـن
مردنی له رێگای مـیللەتا چاكتره له ژین له زیللەتا
هەركەس خۆی بكا به قوربانی میللەت
له قەبرا هەتا مەحشەر ناكێشێ زیللەت

***

ئافرەت به منالەوه:

یـــاران‌و رەفـیقان‌و دلێـرو یــەلی كـــوردان
شەڕ جەژنی هەموومانه بڕۆین بۆ سەفی مەیدان

وەختێ کە بە تەوفیق‌و زەفەر دێنەوە لامان
ئەوسا گوڵ ئەکەین ئێمە بە شاباشی قەدەمتان
گەر لە ئێوە چەند کەس شەهید بێ
لازمە عەزای ئێمە عید بێ
ئەم پڵنگ بەچانەی وا ئینتیقام سێنن
گەورەیان ئەکەین ئێمە، حەقتان ئەسێنن

***

کچەکان:

ئێمە کە نەمانکردووە بۆنی چەمەنی شوو
مەجهوولی نەزەرمانە گوڵ‌و نەستەرەنی شوو[1]
ئەم تازە جەوانانە لەبەر سیرەتی ئێمە
گەر بێتو بکەن ئارەزوویی شیرکەتی ئێمە...
لازمە کە دەعوەت بفەرموون
بێنەوە بە روویێکی گوڵگوون
یەعنی چیهرە رەنگین بن بە شان‌و زەفەر
خوێنی دوژمن بڕژێنن بە نووکی خەنجەر

***

---

(١) نەستەرەن: نەسرین، [ناوی گوڵێکە].

چەك بەدەستەکان:

ئـێمە کـە مـوسەڵڵەح لە دەرو دەشتو لە شـارین
سوێن خۆری حوزووری حەقو بابو کەسوکارین
بـۆ مـەسعەدەتی ئـەم وەتـەنو میللەتی کـوردە
ریشـەو رەگـی زاڵـم بـبڕین بـەم دەسو بـردە

***

تـاکـەی لە زەحـمەتا بـین   لەنـاو مـەزللەتا بـین
لازمـە بـە کـەیفو مـەسەڕڕەت   ڕۆح بکەین بە قوربانی میللەت
زاتـەن ئـێمە خـولقاوین   بـۆ خـزمەت کـردن
بـۆ ئـەوەی فـیدا کـار بـین   تـا رۆژی مـردن...(١)

***

## وردەو چوار خشتەکی

- ١ -

ئەی قەبری تیرە، «ئەحمەدی حاجی رەحیم»ی کورد
گەنجێکی سەر بە مۆرە کلیلی بە تۆ درا

---

(١) لە خوێندنەوەی ئەم شیعرانەوە دەرئەکەوێ لە هەندێ تا «مصرع»یانا لەنگییێکی ئاشکرا هەیە. ئێمە چاری ئەو لەنگیانەمان پێ نەکرا چونکە لە کتێبی «گۆرانی کوردی» بەولاوە سەرچاوەیەکی ترمان لا نەبوو، لەویشا بەم جۆرە نووسرابووەوە، کە ئێمە لێرەدا بڵاومان کردووەتەوە.

تۆش بۆ خوا، قوسوور مەکە، قوربان لە خزمەتی
یەعنی بە رۆژ هەتاوی سەری بەو، بە شەو چرا
تەئریخی کۆچی موعجەمی ئەم شەترە کافییە...
«لاوێکی بەرزی وا لە غەریبی شەهید کرا»(١)

***

- ٢ -

لە ساڵی مەغفیرەتی «عارف ئەفەندی» ئالی حەسەن
ئەگەر سوئال ئەکەن ئەی بولبولانی باخی لەقا
بەدەم سەباوە برا مردووانە «بێخود» ئەڵێ:
«لە خاکی نزمی فناگەییە سەطحی بەرزی بقا»(٢)

***

- ٣ -

پرسیم لە ئەدیبێکی حەزین ساڵی وەفاتی
«شوکری»، کە دۆعای عەفوی ئەکەن حازرو غائیب

---

(١) تیرە: تاریك. شەتر، [شَطر]: نیوە شیعر. ئەم پارچەیە بەبۆنەی کوژرانی «ئەحمەد حاجی رەحیم»ەوە وتراوە، کە لە «بەغدا» لە راپەڕینەکەی «تەشرین»ی ١٩٥٢دا شەهید کرا. نیوە شیعری دوایی مێژووی شەهید کرانیەتی بە ساڵی هیجری: ١٣٧١.

(٢) ئەم پارچەیە بەبۆنەی وەفاتی «عارف ئەفەندی» کوڕی حاجی «حەسەن ئەفەندی»یەوە وتراوە کە لە ساڵی ١٣٧٣ی هیجریدا کۆچی دوایی کردووە.

بەم شیعرە ئەویش جوابی منی دایەوە، فەرمووی:
ئەی «بێخود»ی ئالوودە بە ئەنواعی مەسائیب
تەئریخی فەنایی ئەبەدی «شوکریی نائیب»:
«تَأریخِ فناءِ اَبَدِي شکرِي نائِب»(١)

***

- ٤ -

کە ساڵی مەغفیرەتی «حاجی ساڵح»م پرسی
لە شاعیرێکی وەکوو «بێخود»ی بەدیعە نیکات
ئەویش موناسیبی ئەو جان فیدایی ساداتە
وتی: «شَهیدِ صحیحِ محبّتِ سادات»(٢)

***

- ٥ -

«لَهُ الثَّنا» کە بە مەقسوودی دڵ دووبارە گوڵی کرد
شکۆفەیێ لە درەختی ریازی ئیرسی نوبووەت
سوئالی مەولیدی ئەم شاهزادەیەم لە خیرەد کرد

---

(١) ئەم پارچەیە بۆ مێژووی وەفاتی «شوکری سەعید ئەفەندی نائیب»ە لە کەرکووك کە لە ساڵی ١٩٥٣ی میلادیدا کۆچی دوایی کردووە.
(٢) ئەم پارچەیە بەبۆنەی مردنی حاجی «ساڵح شەل»ەوە وتراوە کە لە ساڵی ١٣٥١ی هیجریدا فەوتی کردووە، وە ساڵی مردنی بە حرووفی ئەبجەد ئەکاتە: «شَهیدِ صحیحِ محبّتِ سادات-شەهیدی سەحیحی مەحەببەتی سادات».

که جێگەیان بووە هەر پایتەختی عیلمو زەکاوەت
جوابی داوە، بەرەو قیبلە دەستی هەڵبڕی، فەرمووی:
«بدەی دەوامی الٰهی لەسر سریرِ دیانت»(١)

***

- ٦ -

«بێخود» ئەتەوێ قەسری قەناعەت بێ جێت
رازی بە بەوەی کەوا خودا داویە پێت
گەر بچیە گەرووی تەنگی نەهەنگیشەوە، تۆ
ئەو رزقە کە دانراوە بۆت ئەی نێرێت...

***

- ٧ -

عالم، خوا نەکردە، نەبێ، ئەبنە گاو و کەر
بۆ دایكو خوشكو کچ، کوڕو باوكو برایی کورد
لەم دەشتی پڕ لە دێوو درنجو جنۆکەیە
وەك خدری زیندە وایە مەلای دین پەنایی کورد

---

(١) «لَهُ الثَّنا»: سوپاس بۆ خوا. شکۆفە: گڵۆکی درەخت. خیرەد: عاقڵ. ئەم پارچەیە بۆ لەدایك بوونی «محەممەد جەلال» کوڕی مەلا «محەممەد سەعید»ی حاجی مەلا «ئەحمەدی دێڵێژە»یی وتراوە کە لە ساڵی ١٣٥٨ی هیجریدا لەدایك بووە. وە ساڵی لەدایك بوونەکەی بە حیسابی ئەبجەد ئەکاتە «بدەی دەوامی الٰهی لەسر سریرِ دیانت -بدەی دەوامی ئیلاهی لەسەر سەریری دیانەت».

«بِاللهِ» مەلایە بۆ سەری ئەم قەومە چەتری دین
«تَاللهِ» عەسایە بۆ دەسی میللەت مەلایی کورد

***

- ٨ -

یارەببی بە جاهی جامی ساقیی کەوسەر
یارەببی بە تووبایی قەدو باڵای دوڵبەر
«بێخود» کە لە دۆزەخی گوناهایە مەدام
بی‌بەخشە بە چاوە جوانەکەی پێغەمبەرﷺ

***

- ٩ -

«بێخود» ئەم تەئریخە تۆ داتناوە لەم نیو شیعرەدا
زەحمەتە سنعاتی واکەس کردبێتی بێ خیلاف
ساڵی تەولیدی «حەسەن بەگ زادە» سەروەر فەحلی جاف
«سالِ تَولیدِ حسن بگ زادە سرور فحلِ جاف»(١)

***

- ١٠ -

سەرسەری مردن کە هات‌و دای بە با وەك گەردە لوول
خەرمەنی عومری تیجارێکی نەجیب ئەی «بُو الفُضُول»

---

(١) مێژووی لە دایك بوونی «سەروەر»ی کوڕی «حەسەن فەهمی بەگی جاف»ە کە لە ساڵی ١٣٦٦ی هیجریدا لە دایك بووە.

«بێخود»یش ئەم نیوە شیعرەی کردە تەئریخی، وتی:
«مَعفُوە حاجی فتاحی قادری حاجی رسول»(١)

***

- ١١ -

سەیید نەسەبێ لە نەسڵی «زەهرا»یی «بەتوول»
یەعنی نەتەوەی «عەلی» فوحوولی ئیبنی فوحوول
بۆ ساڵی ویلادەتی ئەو ئارامی دڵە
«بێخود» وتی: «شێخ محمّد اولادِ رسول»(٢)

***

- ١٢ -

«بێخود» لە رووی نیازەوە، ئەی نازەنین ئەڵێ:
جارجار بە چاوی لوتف بڕوانە سوورەتم
من بۆیە سەیری تۆ ئەکەم‌و رووم لە کەس نیە
تا تێ بگەی کە تۆی هەدەفی تیری حیرەتم(٣)

***

(١) سەڕسەڕ، [صَر صَر]: رەشەبای توند. مێژووی کۆچی دوایی ئەم خوا لێ خوش بووە ئەکاتە ١٣٥٥ی هیجری.
(٢) ئەم پارچەیە مێژووی لە دایك بوونی شێخ «محەممەد»ی کوڕی خوا لێ خوش بوو مامۆستا «شێخ رەسوول»ی مامۆستای مزگەوتی «جامیعە»ی هەڵەبجەیە کە لە ساڵی ١٣٤٠ی هیجریدا لە دایك بووە.
(٣) ئەم پارچەیە بۆ ئەوە وتراوە لەسەر وێنەیێکی «فۆتۆغرافی» شاعیر خۆی بنووسرێ.

- ١٣ -

بڵا فرمێسکی خوێنین بۆ نەڕێژێ بیلبیلەی چاوم
بە حەرفی ناڵە بۆ نەپژێ زمانی لاڵ و گیراوم
نەمامی عەیشەکەم نێژرا، خەفەت گۆپکەو چرۆی دەرکرد
سەراپا تەرزی غەم ئاڵایە گیانی هەڵ کڕووزاوم

دەسا ئەی «میرزا مەهدی»ی زەمان، ئەی «کاشی»ی نادر
کە بۆ نادیدە خەتتاتێکی چەشنی ئێوە داماوم
لە کێلی قەبرەکەی تەئریخی کۆچی کاکە «ئیبراهیم»
بنووسن: «شێخ برایم رۆ» بە خوێناوی گەشی چاوم(١)

***

- ١٤ -

ئەمجا لە عوودو روودو نەی و مەی شەراب ئەدووم
یەعنی لە غەیری ساقی و موتریب خراپ ئەدووم
لەوساوە عاشقم بە برۆو روویی دوڵبەران
دایم لە مانگی یەك شەوەو ئافتاب ئەدووم(٢)

***

---

(١) مێژووی کۆچی دوایی شێخ «برایم»ی شێخ «ساڵح»ە کە لە ساڵی ١٣٦٩ی هیجریدا مردووە.
(٢) روود: ئاوازێکە لێ ئەدرێ.

- ١٥ -

کاکا کابرا شە شەوو ڕۆژ خە خەریکی بەزمە
خەخە خەڵقیش لە لە داخا ئە ئەکاتن شیوەن
تۆ تۆ تۆ وا لە لەبەرتا سە سە سەڵتەی حەڵەبی
مممن وا لە لەبەرما پا پا پاڵتۆی جەرمەن
مممن هەم نە نەخۆشم چە چە چەشنی تۆ تۆ تۆ
تۆ تۆ تۆ هەم نە نەخۆشی چە چە چەشنی مممن(١)

***

- ١٦ -

حەسرەتا دیسان پەیا بوو پایزی شین‌و گرین
زوو بەسەر چوو نەوبەهاری عەیش‌و نۆش‌و پێکەنین!
خادیمی شەرع‌و دیانەت کاکە «ئەورەحمان شەرەف»
کۆچی فەرموو ناگەهان بۆ گوڵشەنی خولدی بەرین
«بێخود»یش ئەم میسرەعەی نووسی بە تەئریخی وتی:
«جنّت ئارا بوو، برا قائم مقامی نازەنین»(٢)

***

(١) ئەم پارچەیە بە شێوەی قسەکردنی لاڵ وتراوە.
(٢) ناگەهان: لە پڕ. ئەم پارچەیە بۆ مێژووی کۆچی دوایی «عبد الرّحمان شَرَف» وتراوە کە لە ساڵی ١٣٧٣ی هیجریدا مردووە، وە ساڵی مردنەکەی بە حیسابی ئەبجەد ئەکاتە «جنت ئارا بو برا قائم مقامی نازەنین-جەننەت ئارا بوو برا قائیم مەقامی نازەنین». وشەی نازەنین ئیشارەتە بۆ ئەوە کە خوا لێ خۆش بوو خەڵکی «هێران»و «نازەنین» بووە.

- ١٧ -

«بِحَمْدِ الله» عەجایب نەوبەهارێ نیکهەت ئەفزا بوو
لە باخی خانەدانێ غونچەیێکی تازە پەیدا بوو
«محەممەد عارفی مەخدوومی» زاتێکی حەسەن خوڵقی
لە بەحری مەعریفەتدا «فِي‌الحَقيقَة» دوڕڕی یەکتا بوو
خیرەد بۆ ساڵی تەئریخی لە دایك بوونی ئەو فەرمووی:
«لە جۆباری نجابت سرونازێ جلوە آرا بو»(١)

***

- ١٨ -

میرم هەتا وەفا و تەوازوع شیعارتە
یەزدان موعین‌و حیرزی دۆعای ئێمە یارتە
بولْبولْ لە فیرقەتی گوڵە کەوتۆتە حەلوەلا
یا دەممە بەم بەیانییە وا بێ قەرارتە

شوکری خودا بە تیری توهەمتەن وەك ئەشکەبوس
سینەی عەدوو بە تێغی حەسادەت فگارتە

(١) ئەم پارچەیە بۆ مێژووی لە دایك بوونی «عارف حیکمەت ئەفەندی» کوڕی حاجی «حەسەن ئەفەندی» وتراوە کە لە ساڵی ١٣٠١ی هیجریدا هاتوەتە دنیاوە، وە ساڵی لە دایك بوونی بە حیسابی ئەبجەد ئەکاتە «لە جۆباری نجابت سرونازێ جلوە آرا بو = لە جۆباری نەجابەت سەروی نازێ جیلوە ئارا بوو».

«بێخود» ئەسیری مەعریفەتت چۆن ئەبێ نەبێ
تۆیێ کە شێری بێشەیی عیرفان شکارتە(١)

***

- ١٩ -

لە حەسرەت لێوی ئاڵی ئەو نیگاری سوخمە شێرداخە
دڵم یا خوێنە، یاخۆ داخە، کارم ئۆفە یا ئاخە
بە یادی شۆخیی ئەو چاو غەزاڵەی کەبك رەفتارە
نەزەرگاهی دڵی دێوانە یا سەحرایە یا شاخە
ئەزانی من شەهیدی غەمزەم ئەی قەبرەڵکەنی دڵسۆز
لە باتی گوڵ لە قەبرا تۆ خودا خارم لە بۆ راخە

***

- ٢٠ -

ئەم زاتە کە ماڵ مودیری هەولێرە
هەم سەییدە، هەم شاعیرە، هەم چاو تێرە
بۆ ئێوەیە ئەم روباعییەی نووسیوە
مەمنونم ئەگەر کەو شك ئەبەن بینێرە

---

(١) حـــیرز: دۆعـــای چـاوەزار. تـوهەمتەن: لەقـەبی رۆسـتەمی زاڵە. ئـەشکەبوس: قـارەمانێکـی لەشکـری ئـەفراسـیاب بـووە روسـتەم کوشتوویەتی. بێخود ئەم شیعرانەی بۆ «حەسەن فـەهمی بـەگی جـاف» نووسیووە.

بەندە کە دەمێکە لێرەمو میوانم
پەیوەندی جەنابی «سافی»ی ئێرانم
یەعنی بە ئومیدی زیارەتی دانیشتووم
ڕۆح هاتە دەرێ، کەچی نەهات جانانم(١)

***

- ٢١ -

«بێخود» شەوەکەی هەتا بڵێی تاریکە
ڕێگەش بە خودا درێژو زۆر باریکە
کاروان هەموو باری کردووە ڕۆیشتن، تۆش
خۆت گورجەوەکە ڕۆینت نێزیکە(٢)

***

- ٢٢ -

فیدات بم تۆو خودا ئەی قەبری تەنگو تیرە بڕوانە
کە ڕووناکی دوو چاوی «بێخود»ت ئێستاکە میوانە

---

(١) بێخود ئەم چوارینانەی لەگەڵ ئەم چوارینەی خوارەوەی «رەمزی»دا ناردووە بۆ «سافی»:
بیستوومە ئەڵێن جەنابی کاکی ئێران
فەریادڕەسو دەلیلە بۆ داماوان
عەرزی بکە سا لە مێژە قوربان «ڕەمزی»
داماوە لەبۆ کەوێکی راوی خۆش خوان
(٢) ئەم چوار خشتەکییە دوا شیعری بێخودە.

ئەگەر دیققەت بکەی لەم میسرەعی تەئریخە، ئەیزانی
«لەبیبێ بۆتە میوانت کە آرامی دڵو جانە»(١)

***

- ٢٣ -

سەندت لە دەسم خودا هەرچی مۆلکی منە
دات بەو تەرەسەی کەوا نە پیاوەو نە ژنە
لەم گەردشی چەرخە تێ گەیىم ئەی بێ باك
شیر لێ دەرو دەف زەنت وەکوو یەك لە کنە(٢)

***

- ٢٤ -

ئەی خاکی سیاه «مصطفی مظهر بەگ»
بیناسە مودیرێکە مەعاریف پایە
وا هاتو لە خزمەتی نەفەرمووی سستی

(١) ئەم پارچەیە مێژووی مردنی شێخ «عەزیز»ی کوڕی شێخ «سالح»ی حاجی شێخ «غەنی»یە کە لە ساڵی ١٣٥٥ی هیجریدا کۆچی دوایی کردووە.
(٢) ئەم پارچەیە تەرجەمەی چوار خشتەکییەکی «لوتف عەلی خانی زەند»ە. وە شاعێر لەسەر خواستی «حەسەن فەهمی بەگی جاف» وەریگێڕاوەتە سەرکوردی. ئەمەش چوار خشتەکییەکەی لوتف عەلی خان:
یا ربّ ستدی ملك ز دست چو منی
دادی بە مخنثی، نە مردی نە زنی
از گردش روزگار معلومم شُد
پیش تو چە دف زنی، چە شمشیر زنی.

چونکی ئەوە وەك هوما و تۆ وەك سایە
بۆ ساڵی وەفات‌و ریحلەتی «بێخود» ئەڵێ:
«صەدرێکە لە خانەدانی قازانقایە»(١)

***

- ٢٥ -

لە «بێخود» ویستیان بۆ کۆچی شێخ «ئەحمەد» لەقەب «موختار»
بە هیجریش ساڵی تەئریخی بڵێ ئەو پیری وەستایە
ئەویش فوجئی لە تەئسیراتی خەرقی عادەتی مەرحووم
بە حەرفی جەوهەری نووسی کە «قازی جنّت آرایە»(٢)

***

- ٢٦ -

حەپس‌و عەزلی من لەسەر شانم ئەگەرچی برمەیە
چونکە ئەمری ئێوە بوو پاڵتاوی شاڵی تورمەیە
گەردی رێت تاکەی لە «بێخود» مەنع ئەکەی ئەی ماهی «میسر»
چاوی ئەم یەعقووبە موحتاجی جەواهێر سورمەیە

***

(١) ئەم پارچەیە مێژووی وەفاتی «موستەفا مەزهەری» مودیری مەعاریفی لیوای سلێمانییە کە لە ساڵی ١٣٦٥ی هیجریدا کۆچی دوایی کردووە.
(٢) فوجئی: کوتوپڕ. ئەم پارچە شیعرە بۆ مێژووی وەفاتی شێخ «ئەحمەدی قازی»یە کە لە ساڵی ١٣٧٣ی هیجریدا کۆچی دوایی کردووە.

- ٢٧ -

«بێخود» تاکەی خەریکی ئیشی قۆڕی
بۆ گرتنی ماسیی هەوا وەك تۆڕی
بۆ گۆڕی جیهان ئەگەر بە «بەهرام»یش بی
بەخوا قەسەم ئاخری ئەسیری گۆڕی (١)

***

- ٢٨ -

من کە ئیسلامم لە سایەی موعجیزەی پێغەمبەری
ئەم ئەبووجەهلانە، «بێخود» پێم ئەڵێن تۆ کافری
رەببی روو رەش بم ئەگەر نێزیکی ئەم بوختانە بم
خۆ ئەگەر دوورم ئیلاهی، روو سپی بێ موفتەری (٢)

***

- ٢٩ -

ئەی پیاڵەگێڕی مەجلیسی تۆ «تووسی» نەوزەری
«کەیخوسرەو»ی زەمانی و «جەمشید»ی کیشوەری

---

(١) بەهرام: بەهرامی گۆڕ، یەکێك بووە لە پادشایانی ئێران. گۆڕ «ی یەکەم»: کەری وەحشی، بۆیە کراوە بە لەقەبی بەهرام چونکە هەمیشە راوی ئەم حەیوانەی کردووە.

(٢) روو سپی: سۆزانی. موفتەری: بوختان کەر. بێخود لەسەر ئەم پارچەیە نووسیویە کەوا لە سەردەمی حوکمداری خوا لێ خۆش بوو «شێخ مەحموود»دا چوو بوون عەرزیان کردبوو بێخود بۆ تورکەکان کار ئەکا، جا ئەمیش بەم دوو شێعرە وەرامی ئەو بوختانە ئەداتەوە.

تەندووری دڵ بە ئاگری غەم جۆشی سەندووە
بەزمم دەمێکە ساردە لەبەر بێ سەماوەری (١)

***

- ٣٠ -

«بێخود» بەسە بۆ وەفاتی «ئەحمەد موختار»
ئەم میسرەعە، دەك خوای لێ بێ رازی
تەئریخی موجەوهەری ویداعی قازی:
«تأریخی مجوهری وداعی قاضی» (٢)

***

- ٣١ -

هەرچەندە دەوایی سەد دڵە لەو پەرچەمەت تەڵێ
ئەم پەندە تۆ لە من ببیێو هیچ قسەش مەڵێ
لەم بەزمی موسکیراتە دلێرانە زوو هەڵێ
قەی کردنی سوراحی، ئەگەر تێ بگەی، ئەڵێ

---

(١) تووسی نەوزەری: قارەمانێکی کۆنی ئێرانە. کیشوەری: خاوەن وڵات. کیشوەر: وڵات. دیارە بێخود بەم چوارینەیە داوای سەماوەری لە برادەرێکی کردووە.

(٢) ئەم پارچەیە بۆ مێژووی وەفاتی شێخ «ئەحمەد موختار ئەفەندی» کوڕی شێخ «عبد الله»ی کوڕی شێخ «ئەحمەدی هەولێری»یە کە لە ساڵی ١٩٥٣ی میلادیدا کۆچی دوایی کردووە. وە ئەم مێژووە بە حیسابی ئەبجەد ئەکاتە حەرفە نوختە دارەکانی ئەم نیوە شیعرەیە: «تأریخی مجوهری وداعی قاضی».

دڵ تێکەڵاتنە لەگەڵ ئەم خەڵقە تێکەڵی...[(١)]

***

[ ٣٢ ]

«بێخود» مەبە قەت تێکەڵی دنیایی دەنی
هەر رووت بە لە ئەلبیسەو قوماشی وەتەنی
بۆ خاکی وجوودی تۆ لەڕێی تەجریدا
ئیکسیرە نیگاهێکی رەسوولی مەدەنی

***

[ ٣٣ ]

«بێخود» وەرە بێ پەردە بڵێ خۆت وتەنی
ئەم شیعرە بە بای سەبای عێراقیو یەمەنی
رۆحی منو پەروانەیی شەمعی سەری «غەوس»
دەستی منو داوێنی «ئووەیسی قەرەنی»[(٢)]

***

[ ٣٤ ]

«بێخود» ئەم شیعرەیە تەئریخی وەفاتی زاتێ
کە کەسێ بوو بە وەفا و بە حقووقو وەتەنی

---

(١) قەی کردن: رشاندنەوە. مەبەست لە بڵقە بڵقی سوراحییە لەکاتی مەی لێ داکردنیا.
(٢) ئووەیسی قەرەنی: وەیسی مایدەشت، یەکێکە لە «تابعین».

«کاك امین زاده عزیزِ هموکەس کاکە حَمە
رَب عَفوی کە بە اِعجازِ رسولِ مَدَنی»(١)

***

[ ٣٥ ]

«بێخود» لە خەوی غەفڵەت ئەگەر هەڵساوی
ئەم پەندە بەگوێیی دڵ ببیێ تا ماوی
وەك تەرکی تەماشایی ژنت کردووە هەتیو
مەڕوانە لیباسیشی ئەگەر تۆ پیاوی!

***

[ ٣٦ ]

یا رەب بە شەفاعەتی شەهی سەرمەدەکەی
«بێخود» لە سەگانی قاپیی ئەو عەدکەی
یەعنی لە موحاکەماتی رۆژی حەشرا
ئەوراقی گوناهی ئەو بە رەحمەت سەدکەی(٢)

***

[ ٣٧ ]

ئەگەر ئاغا لەدنیا زۆر فەقیرو موستەحەق رۆیی

---

(١) ئەم پارچەیە بۆ مێژووی وەفاتی «کاکە حەمەی ئەمینی عەتتار» وتراوە. کە لە ساڵی ١٣٧٠ی هیجریدا کۆچی دوایی کردووە، وە ساڵی مردنی بە حیسابی ئەبجەد ئەکاتە شیعری دووهەم بەو شێوەیە کە نووسراوەتەوە.
(٢) عەدکەی: بژمێری. سەدکەی: داخەی.

به ئوممێدی زەکاتی عەفو بۆ دەرگاهی حەق ڕۆیی
له «بێخود» پرسیان ساڵی وەفاتی، چونکه تیفۆی بوو
وتی: نووسیومه «قالهٔ تۆفیق آغا» بێ «عَرَق» ڕۆیی (١)

***

## تاك

کەی بێ تۆ بەهار بیو تۆ نیگار بێتو ویساڵ بیت
بــیبینێ ڕەقــیب ڕۆحــی له داخــا دەرچــێت (٢)

***

«مشك»و «گا» جووتو «پڵەنگ»، «کەروێشك»و «ماسی»، گەورە «مار»
«ئەسپ»و «مەڕ»، «مەیموون»و «مورغ»و «سەگ»، «بەراز»ی شفرە دار (٣)

***

---

(١) ئەم پارچەیە بەبۆنەی کۆچی دوایی «قالەی تۆفێق ئاغا»وە وتراوە کە له ساڵی ١٣٦٤ی هیجریدا مردووە، وە ساڵی مردنەکەی بە حیسابی ئەبجەد ئەکاتە «قالهٔ تۆفیق آغا = قالەی تۆفێق ئاغا» بەو مـەرجـە کـە "٣٧٠"ی لێ دەرکەی کە بەرانبەری وشـەی «عَـرَق = عـەرەق»ە. واتـە ژمـارەی وشـەی «عَرَق» له «قالهٔ توفیق آغا» دەرکە ساڵی مردنی دەرئەچێ!. لێرەدا ئیشارەت بۆ ئەوە کراوە کە [نەخۆشی] «گرانه تادار» ئەگەر ئارەق بکا چاك ئەبێتەوە، ئەگینا ئەمرێ.
(٢) بۆ خوا لێ خۆش بوو شێخ «مەحموود حەفید»ی نووسیوە.
(٣) ئاسمان شوناسانی کۆن ساڵانیان بەپێی ئەم شیعرە بـەسەر حـەیوانـاتا دابەش کردووە.

«مارت»و «نیسان»، «مایس»و مانگی «حـوزەیران»و «تـەمووز»
«ئاب»و «ئەیلوول»و دوو «تەشرین»و دوو «کانوون»و «شوبات»

***

گەرەکتە گەر نەکەی وەختێ کە چوویتە شاری «تەق تەق» تـەق
دەخیلت بم نەکەی قەت جێ بە تەیری «حاجی لەق لەق» لەق(١)

***

ساڵی بێ بارانیو ئەشیا گرانی، ئەی ڕەفێق
«سالِ بیٚ بارانیٔ اشیا گرانی ای رفـیق»(٢)

***

ئـــەی گـــوڵی گـــوڵستانی کـــوردستان
وەی مەلی نەشئە بەخشی پیرو جەوان(٣)

***

«جەمال فەهمی» کـە سـاڵۆنی زەفـافی پـڕ تـەدارەك بـوو
«بِحَمْدِ الله» بە تەئریخ «کاری خێری لێ موبارەك بوو»(٤)

***

(١) ئەم شیعرە پێکەنینارییەم لە شێخ «ڕەئووف خانەقا» وەرگرتووە.
(٢) ئەم شیعرە مێژووی ساڵە گرانییەکـەی سـەردەمی جـەنگی دووهـەمی جیهانە کە ئەکاتە: ١٣٦١ی هیجری. [ساڵی بێ بارانیو ئەشیا گرانـی ئـەی ڕەفێق].
(٣) بۆ خوا لێ خۆش بوو شێخ «مەحموود حەفید»ی نووسیوە.
(٤) مێژووی سـاڵی ژن هـێنـانی «جـەمال»ی کـوڕی خـوا لێ خـۆش بـۆو «ئەحمەد فەهمی ئەفەندی» جوانڕۆییە کە ئەکاتە ١٣٧٣ی هیجری.

دەستم کە بە سەد وەعدە لە سەد لاوە شکاوە

جەبری نیە ئەم کەسرە هەتا نەیخەمە ئەستۆ

***

ئەوی دانایە جەرگی وەك پەلاسە   ئەوی نادانە نازانێ چ باسە

***

کاغەزت هات‌و دڵی مردووی منی چا کردەوە

وەك «مەسیحا» «سام»ی ئیبنی «نوح»ی ئیحیا کردەوە

***

کاغەزم نووسی بە خوێنی دیدەکەم

نووری چاوم، رۆحەکەم، بیخوێنەوە

***

کە پرسیم ساڵی تەئریخی زەفافی «قُرَّةُ العَیْن»م

خیرەد دەرلەحەزە فەرمووی: «کارِ خێری لێ مبارك بێ»(١)

***

لە ئەسبابی فەرەح ساڵۆنی بەزمت پڕ تەدارەك بێ

شەوت هەر رۆژو، رۆژت جەژن‌و جەژنت لێ موبارەك بێ

***

---

(١) دەرلەحزە: دەس‌بەجێ. مێژووی ژن هێنانی شێخ «محەممەد»ی کوڕی خوا لێ خۆش بوو مامۆستا شێخ «عبد الكریمی ئەحمەد برندە»یە کە بە جیسابی ئەبجەد ئەکاتە «کار خێری لێ مبارك بێ = کاری خێری لێ موبارەك بێ» واتە ساڵی ١٣٥٦ی هیجری.

ئەگەر مەیلت لە دڵ دەرچێ هەتا ڕۆژی جەزا «بێخود»
جەزای ئەو بێ وەفایە ڕەبیی دەردی بێ وەفایی بێ

***

تەئریخی عەزل‌و حەپسی «ڕەزا شاهی پەهلەوی»
ئەبجەد ئەگەر بزانی «رضا شاهِ پهلوی»[(١)]

***

(١) ناوەکەی ئەکاتە ١٣٦٠ کە بە ساڵی هیجری مێژووی داگرتنیەتی لە تەخت.